

وەرگێڕانی:
ئەرسەلان عەبدوڵڵا

ژیان و بیرەوەری

# ZIDANE

## لە باوەشی مافیاوە بۆ ڕیزی ئەفسانەکان



بلیمەتیی محەمەد عەلی کلای، شێکیۆشیی مایکڵ جۆردان، ئەفسانەیی پیپ ڕۆت، هێزی جیمس براون، خۆڕاگریی جاکی ڕۆبسن، مرۆڤدۆستیی ئێرتۆن سینا، ئەمەگداریی پاولۆ مالدینی، ناوبانگی پێلێ و چێژی مارادۆنای کۆکردەوە.

ئەم کتێبە گەشتێکە بە نێو ژیانی زیدان، نهێنییەکانی، پەیوەندیی لەگەڵ تۆپی پێ، چیرۆکە ئیلهامبەخش و سەرنجڕاکێشەکانی لە گەڕەکی لاکاستێلان، کە بەهرەمەندی و کەسایەتیی ئەوی تێدا دروست بوو، پێش ئەوەی ببێتە یاریگەر، هەروەها هەموو چیرۆکەکانی، لە منداڵییەوە، کە نقووم بوو لە زەحمەتی، دەورەدرابوو بە تارمایی و هەژاری و ڕەگەزپەرستی و چەتەکانی تاوان و مافیا، تەنانەت دانیشتنی تەنیای لەسەر مێزی پێلێ و مارادۆنا، دوو لە ئەفسانەکانی تۆپی پێ، کە ئەویش بوو بە سێیەمیان.

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان



# زیدان...

## لە باوەشی مافیاوە بۆ ریزی ئەفسانەکان

عەبدولعەزیز ئەلنەهدی

وەرگێڕانی بۆ کوردی: ئەرسەلان عەبدوڵڵا

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارام مەلا محەمەد

ناوی کتێب: زیدان.. لە باوەشی مافیاوە بۆ ریزی ئەفسانەکان

نوسینی: عەبدولعەزیز ئەلنەهدی

وەرگێڕانی: ئەرسەلان عەبدوڵڵا

بابەت: وەرزشی

دیزاین: کۆمپانیای کتێب

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

تیراژ: ١٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٨٤١) ساڵی (٢٠١٨) پێدراوە.

ناونیشان: سلێمانی - فولکەی گۆزەکان - شەقامی ئیبراهیم پاشا

پەیوەندی: ٠٧٧٠١٩٧٤٦٥٦ - ٠٧٥٠١٥٩٠٠٣٢

وەرگێڕانی بۆ کوردی: ئەرسەلان عەبدوڵڵا



لەدایکبوونی
زیدان لە
1972، لە
شاری مارسیلیای
فەرەنسا.



زیدان لەگەڵ تیپی منداڵان.



زیزۆ لە ساڵی 1980 و لە تەمەنی 8 ساڵی، بە درێسی وەرزشییەوە.



زیزۆ لە ساڵی 1984 لە تەمەنی 12 ساڵیدا.




زیدان لە ساڵی 1990 لە تەمەنی 18 ساڵیدا.

وەرگێڕانی بۆ کوردی: ئەرسەلان عەبدوڵڵا



زیدان لە ساڵی 1994 و لە تەمەنی 22 ساڵیدا
هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو ڤیرۆنیکای ئیسپانیدا کرد




زیزۆ لە ساڵی 2001 وەکو گرانبەهاترین یاریزانی ئەوکات، پەیوەندیی بە یانەی ریال مەدریدی ئیسپانییەوە کرد.



زیدان لە 1998 لە تەمەنی 26 ساڵیدا نازناوی گرانبەهای جامی جیهانی بۆ فەرەنسا بەدەستهێنا.



لە ساڵی 1991 و لە تەمەنی 19 ساڵیدا، یەکەم یاریی فەرمی بە دریسی فەرەنسا ئەنجام دا.



زیزۆ لە بەیەکگەیشتنێکی مێژوویيدا لەگەڵ هەردوو ئەفسانەی تۆپی پێ "پێلێ و مارادۆنا".



زیدان لە نێوان ئیسماعیلی باوکی و لەیلای دایکیدا.



سێلفییەك لەگەڵ کوڕەکانی "ئینزۆ، لوکا، ئیلیاس و تیۆ".




زیدان و ساتی پۆشینی درێسی هەڵبژاردەی فەرەنسا بۆ یەکەمجار.

## لەبری پێشەکی:

کتێبخانەی کوردی هێشتا لە کتێب و سەرچاوەی وەرزشییدا هەژارە، ئەمەش پەیوەندیی بە بارودۆخی جیاجیاوە هەیە، لەوانە نەبوونی سەرچاوەی باشی کتێبی وەرزشی بۆ وەرگێڕان و هەروەها کەمبایەخیی دەزگەکانی چاپ و بڵاوکردنەوە بۆ کتێبی وەرزشی، لە لایەکی دیکەشەوە کەمتوانایی نووسەرانی خۆماڵی بۆ نووسینی کتێب لە بواری وەرزشدا، بۆیە ئێستا و لەم زەمەنەدا پێویستە هەوڵ بدرێت کتێب و بەرهەمەکانی ئەم بوارە زیاتر بکرێن، چونکە لەم رێگەیەوە دوو ئامانجی گرنگ دەپێکین، یەکەمیان "خوێنەری کوردی بە کتێب و بابەتی وەرزشی ئاشنا دەکەین"، دووەمیشیان "وەرزشدۆستان و ئەهلی وەرزش بە کلتوری خوێندنەوە ئاشنا دەکەین"، چونکە ئەمانەی دوایی لە خوێندنەوە و ژیانکردن لەگەڵ کتێبدا تاڕادەیەک دوورن.

دەمەوێـت ئـەوە بڵێـم ژیانـی هـەر ئەسـتێرە و ئەفسـانەیەکی وەرزش و بوارەکانـی دیکـەش، بـۆ خوێنەرانـی کـورد و بـە تایبەتـی وەرزشـوانان، گرنگـە، چونکـە ئەزمـوون و کارکردنی ئـەوان دەبێتـە هەوێـن و ئیلهـام و وانەیەکـی بەپێـز بـۆ ئـەوەی دوای خۆیـان و ڕێچکـەی ژیانـی ئـەو ئەسـتێرانە، دەکرێـت بۆ ژیانـی خۆمـان سـوودی لـێ وەربگریـن و لێیـەوە فێرببیـن.

لـەم کتێبـەدا تیشـک دەخەینـە سـەر ژیانـی ئەفسـانەیەکی دیار و زینـدووی دنیـای تۆپـی پـێ، ئەویـش زەینەدیـن زیدانـی فەرەنسـییە، کـە ژیانـی ئـەو، تاڕادەیـەک لـە ژیانـی زۆرێـک لە گەنجانـی کـوردەوە نزیکـە، ئـەو لـە وڵاتـی دووەمیـدا لـە دایک بـووە و بـە کۆچبـەری و هەژارییـەوە ژیـاوە، لـە کۆڵانەکانـی تـرس و تاوانکاریـدا گـەورە بـووە، لەسـەر یاریگـە خـۆڵ و چیمەنتۆکانـەوە خەونەکانـی دروسـتکردوون و کردوونـی بـە ڕێگـەی سـەرکەوتن، ئـەو بـە شـەونخونی و ماندووبوونی زۆر و بـە جەربەزەیـی گـەورەوە لـە تونێڵـە تاریکەکانـەوە خـۆی گەیاندووەتـە شـەقامە ڕوونـاک و چراخانەکانـی شـانزیلیزێ و سـەکۆکانی سـەرکەوتن لـە پاریس و لەوێشـەوە بـەرەو تۆرینۆ و مەدریـد و ئینجـا بـەرەو هەمـوو جیهـان.

زیـدان ناوێکـی ئاشـنایە بە وەرزشدۆسـتانی کـورد و تەنانەت ئەوانەشـی کە حەزیان بـە وەرزش نییە، چونکە ئەو ناپلیۆنێکی

دیکەی فەرەنسایە و لە مەیدانی فوتبۆڵدا سەرکەوتنی بێ وێنەی بۆ فەرەنسییەکان بەدەستهێناوە و ناوی خۆی لە مێژووی وڵاتەکەی و نەخشەی تۆپی پێی جیهاندا تۆمارکردووە و لە ریزی ئەفسانە گەورەکانی فوتبۆڵدا وەستاوە.

لەم کتێبەشدا بە تەواوی ژیانی (زیزۆ) ئاشنا دەبین. هەر لە ساتی لەدایکبوونەوە، تاوەکو گەیشتنی بە سەکۆ بەرزەکانی سەرکەوتن لە دنیای تۆپی پێدا. کە ئەویش وەکو زۆربەی ئەستێرە ناودارەکانی تۆپی پێ. تاڵی و سوێری زۆری بینیوە تاوەکو خەونەکانی کردوونەتە راستی و ئاواتەکانی هێناونەتە دی و ناوی خۆی بە نەمری لە تابلۆی ئەفسانەکانی تۆپی پێدا هەڵواسیوە.

ئەرسەلان عەبدوڵڵا

# بەشی یەکەم

## پرۆژەی چەتەیەك.. تۆپی پێ هەڵیوەشاندەوە

پەیداکردنی پارووەنانێک هۆکاری یەکەم بوو بۆ کۆچی ئیسماعیلی کوڕە دەشتەکی، لە سەردەمێکدا، کە پریسکی ئاگر لە ئاسمانی یاریگەی سیاسیدا بەرز دەبووەوە، کە وای کردبوو ترس و دڵەڕاوکێ لە جەستەی دواڕۆژی نادیاری یاریگەی ژیاندا بڵاوبێتەوە.

ئیسماعیل کوڕی یەزید، بەرەو وڵاتی فەڕەنسا، وڵاتی ناپلیۆن کۆچی کرد، لە دوای خۆیدا کاری پڕ زەحمەتی شوانەکارەیی جێهێشت، کە بەبێ ویستی خۆی لە زێدی باب و باپیرانیدا، لە گوندی ئاقمونی سادە و کشتوکاڵیدا، لە ناوچەی تیرەکانی ئەعالی لە پارێزگای بیجایە لە باکووری جەزائیردا بۆی مابووەوە.

ئەو کاتەشی بۆ مێژوویەکی دیاریکراو، یان کاتێکی نزیکی کۆچی ئیسماعیل گەڕام، رێککەوت و مێژووی دوور لە یەکترم بینی، بە جۆرێک چیرۆکێک دەڵێت، لە سەرەتای پەنجاکاندا و پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی جەزائیر دژی داگیرکاری فەرەنسا، لە سەرەتای نۆڤێمبەری 1954دا کۆچی کردووە، چیرۆکێکی دیکەش ئاماژە بەوەدەکات، دوای سەرکەوتنی شۆڕش و سەربەخۆیی جەزائیر و دەرکردنی داگیرکەر، لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا، لەگەڵ خەڵکێکی دیکە و لە ترسی هەژاریدا رایانکردووە، کە نەیانتوانیوە زۆرانبازی لەگەڵ هەژاریدا بکەن.

بەرەو مارسیلیا، شاری پێشکەوتن و بازرگانیکردن لە رێگەی بەندەرەکەی، کە دەرگە و شوێنی خۆدەربازکردنیش بووە بۆ ئەوانەی نەبوونی و برسییەتی تەنگی پێ هەڵچنیبوون، بۆ ئەوانەی کە بە رووی برسییەتی و بێ دەرەتانیدا هاواریان لێ هەڵسابوو.

بەڵام من چیرۆکی دووەم بە دوور دەزانم و بۆ ئەوەی یەکەمیان دەچم، کە مێژوونووسی بریتانی دکتۆر ئاندرۆ هاسی، راگری زانکۆی لەندەن لە پاریس، لە یەکێک لە وتارەکانیدا لە رۆژنامەی بەناوبانگی گاردیان پشتڕاستی دەکاتەوە، کە تێیدا باس لە چیرۆکی ژیانی زیدان دەکات، دوای ئەوەی زیزۆ خۆی باسی ژیانی خۆی بۆ ئەو دکتۆرە

کردووه، کاتێک لە دیدارێکدا یەکیان بینیوە.
ئیسماعیلی باوکی زیدان، دواجار قاچی لە خاکی خەونەکاندا دانا، هەروەکو کۆچبەرەکانی دیکەی وڵاتەکەی، چاوی لەوەبوو رابردووی تاڵی بنێژێت، ئیتر لە پاریس نیشتەجێ بوو، لە نزیک بەربەر، کە ئەوکات رووگەی کۆچبەرەکان بوو، دواتر گواستییەوە بۆ خانووە دارەکانی سان دۆنیێ، کە ئەو هیچ کات بیری بۆ ئەوە نەدەچوو، یان بیری لەوە نەدەکردەوە، تەنانەت خەونیشی بەوە نەدەبینی، ئەو شوێنە، کە لەم ساڵانەی دواییدا یاریگەی نیشتیمانیی فەرەنسای لێ بونیادنرا، دوای چوار دەیە دەبێتە شوێنی رووخانی هەڵبژاردەی بەرازیل لە عەرشی تۆپی پێدا لەسەر دەستی کورە بەنازەکەی، زیدان، کە ناوی خۆی لە یادەوەری فەرەنسا و دڵی دانیشتووانەکەیدا هەڵکۆڵی.
باوکی زیدان لە پایتەختدا بەخت یاوەری نەبوو، هەرچەندە دەگوترا رێگە بەرەو دەوڵەمەندبوون سەرەتا بە پاریسدا تێدەپەڕێت، بەڵام بۆ ئەو وانەبوو، بەڵکو بێپارەیی و بێکاری ناچاریان کرد جانتا و خەونەکانی کۆبکاتەوە و لە باکوور و لە کەناری رووباری سینەوە بەرەو کەنارەکانی باکووری دەریای ناوەڕاست هەنگاو بنێت لە باشووری رۆژهەڵاتی فەرەنسادا.

# کات... ناوەڕاستی شەستەکانە.. ئێرە مارسیلیایە

ژیان لەوێدا ئەوەندە سەخت و زەویش ئەوەندە بەرتەسک نەبوو، کلتور و ڕەوشتیش زۆر داخراو نەبوو، دیمۆگرافیای مارسیلیا کراوە و لەبار بوو بۆ ئەوانەی لە نەبوونیدا ڕایانکردبوو، بۆ عەرەبەکان، ئەمازیغییەکان، ڕێبواران، بارودۆخە وەکو ئەوە وابوو بە ئیسماعیل بڵێت: "بڕۆ بە دوای پارەدا بگەڕێ".

لەوێ لە گەڕەکی لاکاستێلان جێگیربوو، لە لای ڕاستیدا هەژاری و لە لای چەپیشدا پێداویستی هەبوو، کلتور و پێکهاتەیەکی جۆراوجۆر هەبوو، بۆیە نهێنیی ململانێیەکان لەوێدا سانا نەبوو، ئەو شوێنە بە بوونی چەتە و مافیای زۆر و تاوانکار و ڕووداوەکانی کوشتن بەناوبانگ بوو،



هـەر ئەمـەش وایکردبوو دایکی زیدان "خاتوو مەلیکە" هەموو رۆژێک لەگەڵ کوڕەکەیدا شەڕێک بکات، هەرکاتێک کوڕەکەی بە نیاز بووبێت لە ماڵ بچێتە دەرەوە، ئەو لە لێوی کۆمەڵگەکەدا ڕەگەزپەرستی و مەترسی دەخوێندەوە، بۆیە لە بەرامبەر خۆشەویستەکەیدا خۆی بەدەستەوە نەدەدا، چونکە زیدانیش منداڵیی نقوومی زەحمەتیی بوو، کە خۆی دوای وازهێنانی لە یاریکردندا باسی کردووە و باسی ئەوە دەکات، ئەگەر باوکی نەبووایە، هەرگیز نەدەگەیشتە ئەو رۆژگارەی کە ئێستا تێیدا دەژیت، ئەگەر ئەو نەبووایە، هەرگیز لەو منداڵە هەڵەپاس و شەڕانگێزانە دوورنەدەبوو، کە بەبێ هیچ ئامانجێک بە کۆڵان و شەقامەکانی گەڕەکەیاندا دەخولانەوە و بە دوای شەڕ و گێچەڵدا دەگەڕان، بۆ ئەوەی کاتی بێکاریی تێدا بەسەرببەن، یان دوور نەبوو ببێتە چەتەیەکی گەمژە و مافیایەک کێشە و گرفت بنێتەوە.

زیدان گەڕەکی لاکاستێلان بە شوێنێکی زەحمەت ناودەبات، لەوێدا کەس فێری تۆپی پێ نابێت بە تەنیا، بەڵکو پێش ئەوە، فێر دەبێت ژیان چۆن دەڕوات بەڕێوە، هەژاری هەموو شوێنێکی تەنیوە، هەمووان لەسەریان پێویستە ڕێگەیەک بدۆزنەوە، خەبات بکەن، هەوڵ بدەن و شەڕ بکەن.

بەڵام منداڵان گرنگترین شتیان تۆپ و میوزیک بووە، دواتر گەورەبوون و تێگەیشتن ژیان چۆنە.

زیدان لە تەمەنی گەنجیدا بەدەست تارمایی رەگەزپەرستیدا ئازاری زۆری چەشتووە، بە هۆی ئەوەی بە رەسەن جەزائیرییە، هەروەک چۆن خانەوادەکەشی بە دەست تارمایی هەژارییەوە زۆریان ناڵاندووە.

لەگەڵ ئەوەشدا زیدان بە پاڵپشتیی باوکی و بە هۆی کەسایەتیی زیرەکی و بلیمەتییەکەی، توانیوویەتی هەموو ئەو مەینەتییانە تێپەڕێنێت، کە رێگەی لە ژیان و رێچکەی کارەکەیدا گرتبوو.

تەنانەت باوکە ماندوونەناسەکە هەموو شەوێک بە گوێی زیدانی کوڕە تازەپێگەیشتووەکەیدا دەچرپاند: "کوڕەکەم، بۆ خەڵکی کۆچبەر پێویستە دوو هێندەی خەڵکی ئاسایی ئێرە، توانای خۆی خەرج بکات، پێویستە هیچ کات خۆی بەدەستەوە نەدات، تەنانەت بیر لە خۆ بەدەستەوەدانیش نەکاتەوە، هەرچەندە ژیان بە روویدا تاریک بێت و هەرچەندە کارەساتی بەسەردا ببارێنێت".

# هەڵگەڕاوەیەکی شەرمن

ئاسمان خەریکە تاریک دەبێت، کەشی گەڕەکی لاکاستێلان، گەڕەکە هەژارەکەی شاری مارسیلیا. منداڵانی گەڕەک هان دەدات هەڵبگەڕێنەوە، کوڕێکی شەرمن لە ماڵێکی بچووکدایە. ئایینەکەی ئیسلامە، بە رەسەن جەزائیرییە، رەگ و ریشەی ئەمازیغییە، لە فەڕەنسا لەدایکبووە و پێگەیشتووە، گوێی لەو رێنمایی و بڕیارانە گرتووە، کە لە ژێر بنمیچی خانووە بچووکەکەدا دەردەچن، لە رێنماییەکاندا هەڵناگەڕێتەوە. مەگەر تەنیا بە خراپە بەسەر ئارەزووەکەیدا بشکێتەوە.

ئەو بەرەو شەقامەکە رادەکات و قاچەکانی خێرا هەنگاو دەنێن لە بەردەم بایەکی ساردی زستاندا. لە دڵیدا ترسی ئەوەی هەیە پێش هاوڕێیەکانی نەگاتە یاریگە چیمەنتۆ و خۆڵاوییەکە، چونکە رەنگە بەشی ئەمڕۆی لە خۆشی و چێژ لە یاریکردندا لە دەست بدات.

"یەزید" گەیشت.. ساڵانێک بەم ناوە بانگیان دەکرد، کە لەسەر ناوی باپیرەیەتی، ئەو و هاوڕێیەکانی ئێستاش ئەو ساتانەیان لەیادە، ئەو دیمەنە کۆنانەیان لە دیواری یادەوەرییاندا پاراستووە، لە خانە هاتەهەتاییەکانیاندا پارێزراوە، هەرچەندە ئەگەر خۆیشیان نەیانەوێت، چونکە هیچ شتێک ناتوانێت بیسڕێتەوە و لاییبات، تەنانەت ناتوانێت بیجولێنێت.

یەزید گەورەبوو.. هاوڕێیەکانیشی نەماون، تەنیا هەندێکیان نەبێت، کە لەگەڵ زەمەندا ماون، ئەوانیش تاکو ئەوکاتەی زانییان هاوڕێ شەرمنەکەی منداڵییان، ئەو هاورێیەکەی تەنیا ئەگەر دایکی لە تۆپ بێبەشی بکردایە، ئەوا هەڵدەگەڕایەوە، ئێستا لاوێکی پیشەگەر و پڕشنگدارە..ئەو "زیدان"ـە.

دواتر فەڕەنسییەکان ناسییان، پێش ئەوەی هەموو جیهان بیناسن، خەڵکی وەرزشدۆست و ناوەرزشدۆستیش، ئەوانەی کە پشتگوێیان نەخست، رێک وەکو ئاو و هەوا دەیانناسی.

# تۆپی پێ لە جۆدۆ دەباتەوە

باشترین چارەسەر بۆ دوورکەوتنە لە کێشە و گرفت لە گەڕەکی لاکاستێلاندا، یاریکردنی تۆپی پێیە، یاریکردنیش لەوێدا لە شوێنێکی بێلایەندا بوو، زۆر نزیک نەبوو لە گەڕەک و زۆر دووریش نەبوو، ئەمەش شتێکی باش بوو لە نێو ئەو دەمارگرژی و ململانێیەی، کە لە گەڕەکدا هەبوو، بە تایبەتی بە هۆی بوونی ئەو خەڵکە گەمژانەی، کە هیچ بایەخێکیان نە بۆ یاری و نە بۆ ژیانیش هەبوو. کاتێکیش کە رووخسارت ئەوە پێشان دەدات یاریزانێکی تۆپی پێیت و بە نزیکی شوێنی چەتە و مافیاکان، یان ئەو شوێنانەی، کە کۆبوونەوەی کەسانی شەڕانگێزە، دەڕۆی، بەڵام هیچ زیانێکت نییە، یان کەس بیر لەوە ناکاتەوە دەتەوێت شەڕێک بۆ خۆشی و سەرگەرمی بنێیتەوە، یان ناتەوێ کەسێک بکوژیت، ئیتر کەسیش بە نامۆیی و رقلێبوونەوە سەیرت ناکات و کارەکات بە خێرایی

تێدەپەڕن.

زیدان بەم شێوەیە باسی گەڕەکی منداڵیی خۆی دەکات، هەروەها دەڵێت: " تۆپ چاکەیەکی گەورەی بەسەرمەوە هەیە، کە وایکرد خۆم لە ئەنجامدانی کاری گەمژانە لەگەڵ هەندێک لە گەنجانی گەڕەکدا بەدوور بگرم".

بەڕێز ئیسماعیل بن یەزید و هاوژینەکەی "مەلیکە"، ئیدی دەیانتوانی کوڕەکەیان ببینن و لێی دڵنیابن، کاتێک یاریی دەکرد و خۆشیی دەبینی لەو یاریگە تارتانەی، کە لە پەنجەرەی چێشتخانەی ماڵەکەیانەوە بۆیان دەڕوانی، ئەو کاتانەشی دایکی خواردنی ئامادە دەکرد و چاودێریی کوڕە بچووکەکەی دەکرد، زیزۆش بۆ براکانی و هاوڕێیەکانی و رکابەرەکانیشی، خۆشترین و باشترین ژەمی تۆپی ئامادە دەکرد!

دایکی ئەگەر پێویستی بکردایە، بانگی دەکرد، بەڵام کە دەیبینی یاریی دەکات، ئەوا ئیتر سەلامەتە و لە بارێکی باشدایە، بەڵام ئەمەش رێگر نەبوو لەوەی هەندێک جار رێگریی لێ بکات، بە تایبەتی ئەگەر بابەتەکە پەیوەندی بە خوێندنی وانەکانەوە هەبووایە.

لاکاستێلان، یەکێک لە گەورەترین گەڕەکەکانی مارسیلیا بوو، ترسناکترین گەڕەکیش بوو، هەردەم بارگرژی لە نێوان دەزگەی پۆلیس و مافیاکانی گەڕەک لە برەودابوو،

لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردووشدا، کێشەکان زیاتر بوون، پۆلیس چەندین جار هێرشی دەبردە سەر گەڕەک بۆ ئەوەی خراپەکارییەکان رابگرێت و ئاسوودەیی لە گەڕەکدا دابین بکات، بەڵام ئامانجەکانیان بە پێی پێویست نەدەهاتەدی.

زیدان لە ژێر سەرپەرشتیی براگەورەکانی لە پاڵەوانیەتیەکانی گەڕەکدا و لە یاریگەیەکی تارتاندا یاریی دەکرد، ئەو یاریگەیەی کە درێژییەکەی نەدەگەیشتە 73 مەتر و پانییەکەشی لە 11 مەتر زیاتر نەبوو، ئەوکات تەمەنی 5 ساڵ بوو، ئەوان ناچاربوون سنوور و هێڵەکانی یاریگەکە بە قوتووی بەتاڵ و جل و پێڵاوەکانیان بکێشن، ئەوکاتە نەیاندەتوانی بە چیمەنتۆی سپی و بۆیە، هێڵەکان دیاریی بکەن.

زیدان زۆر کاریگەربوو بە نورەددینی براگەورەی، کە یاریزانێکی زۆر باشی گەڕەک بوو، کاپتنیش بوو، دەیتوانی یاریزانەکان دابەش بکات و هەر خۆیشی ببێتە ناوبژیوانی یارییەکان، لەگەڵ ئەوەشدا باوکی سوور بوو لەسەر ئەوەی دەبێت زیدان فێری یاریی جۆدۆش بکرێت، کە یارییەکی هونەری کوشتارییە، چونکە ئەو پێی وابوو، ئەو یارییە زیزۆ لە کێشە و گرفت دەپارێزێت و وادەکات لەم تەمەنە بچووکەدا بتوانێت بەرگری لە خۆی بکات بەرامبەر هەرزەکارە شەڕانگێزەکانی گەڕەک، ئەوەشی



که زیاتر باوکی هاندابوو بۆ ئەو کارە، ئەو دێوەزمە ناخۆشانە بوو شەوانە لە خەودا بەرۆکی زیدانیان دەگرت ، کە زۆر جار بە ترساوی لە خەو رادەپەڕی و هاواری دەکرد و تەواوی ماڵەوەی بەئاگا دەهێنا، باوکیشی درەنگانی شەو تاکو بەرەبەیان لە فرۆشگایەکی گەورە کاری دەکرد، کە هەندێک خەڵکی مەغریبیشی لێبوو.

زیدان باسی ئەو سەردەمە دەکات، کە چۆن بە ئارامی نەدەخەوت، ئەوکاتەی دێوەزمەکان بێزاریان دەکرد و دەیانترساند لەم تەمەنە بچووکەدا، بێگومان یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەو بارودۆخەی زیدان، زۆریی تاوان و بوونی چەتەکان بوو لە گەڕەکی لاکاستێلاندا.

زیدان زۆر لەگەڵ یاریی جۆدۆدا بەردەوام نەبوو، نەکەوتە داوی خۆشەویستیی ئەم یارییەوە، بەڵکو کەوتە داوی عەشقی تۆپی پێیەوە، باوکیشی پێی گوت: لێرەدا مافی ئەوەمان نییە رێگریت لێ بکەین، هەر کاتێک تیشکدانەوەی خۆر هەبوو، پێویستە راوی بکەیت".

ئیسماعیل دەینالاند، بەلاّم کەس نەیدەبینی، زەحمەتییەکان زۆر بە توندی رێگەیان لێگرتبوو، بەلاّم هیچ هەڵنەدەگەڕایەوە، بەڵکو تێیپەڕاند، ئەو هێزەشی لە یەزیدی باوکی وەرگرتبوو، لە گوندەکەیان لە ناوچەی قەبیلەکان، لە شوانکارەیی و لە ژێر قامچیی هەژاریدا.

# سەرەتاکان لە دارستان

یەزید، منداڵەکە بەهرەمەندەکە، بڕیاری دا چیدیکە و بە یەکجاری لە ماڵەوە یاریی نەکات، باوکە ئیسماعیلیش ئیتر لە مەینەتی و ئازاری چاککردنەوەی گڵۆپە شکاوەکانی ماڵەوە رزگاری بوو، بەڵام ئەو باوکە، کە شتێکی ئەوتۆ لە بارەی یارییەکەوە نازانێت، رەنگە بە ژیانیشی ئەنجامی نەدابێت، لە ناخی خۆیدا هەستی بەوەکرد کارامەیی ئەو منداڵە ئاسایی نییە، رەنگە ئەمە داهاتووی بێت، رەنگە شانبەشانی ناوبانگ و ئەستێرەیی میشێل پلاتینی بدات، یان رەنگە بەسەر ئەویشدا سەرکەوێت.

یەزید پێڵاوە کۆنەکانی فڕێدا، بەڵام هەستی خۆشەویستی و ئەو عەشقەی بۆ تۆپ هەیبوو، فڕێی نەدا، ئەو لەوە باشتر بوو لە بەتاڵیدا بێت، باوکەش پێڵاوێکی نوێی بۆ کڕی، کە بە بەراورد لەگەڵ پێڵاوەکانی پێشوویدا،



گرانبەها بوو، دڵخۆشییەکی زۆر باڵی بەسەردا کێشا، ئەمجارەیان هونەر و کارامەیی خۆی لە تیپی گەڕەک پیشان دا، کە بە ناوی "تیپی غابە" (دارستان) بوو.

هەر کەسێک بەوێدا تێپەڕیبووایە و سەیری یاریکردنی تیپەکەی بکردایە، دەیتوانی جیاوازی و تایبەتمەندیی زیزۆ ببینێت، پێش ئەوەی لە ناخی خۆیدا بڵێت "ئەو یاریزانە زۆر دەگمەنە، ئەو تەکنیک و کارامەییەی، کە بەهرەمەندییەکەی پێکی هێناوە و قاچەکانی پیشانی دەدەن، هیچ ڕاهێنەرێکی ئەم وڵاتە لە دەستی نادات، ئەگەر ببیینێت". ئەو بە یاریکردن بە تۆپ و بە رکابەرەکانی، چێژی دەبەخشی.

مانگی حوزەیرانی 1982 بوو، ئیسماعیل و هاوژینەکەی و منداڵەکانیان و هاوڕێیەکانیان 10 مۆمیان کوژاندەوە، دوای ئەوەی تەمەنی زەینەدین بوو بە 10 ساڵ.

دوای دوو مانگ لەم بۆنەیە و لە مانگی ئابی هەمان ساڵدا، زیدان کەوتە بەر چاوی شارەزایەک، ئەوانەی بە دوای بەهرەمەنداندا دەگەڕێن، کە بەهرەی ئەو بووە جێی سەرنجی ئەو دۆزەرەوەی بەهرەمەندان و لە بەردەم کارامەییەکانی زیزۆدا دۆش دامابوو، هەربۆیە پێشبڕکێی لەگەڵ کاتدا دەکرد بۆ ئەوەی ڕەزامەندی زیدان و باوکی وەربگرێت و ئامانجی ئەو شارەزایە هاتەدی و زیزۆش یەکەم هەلی بۆ ڕەخسا لەگەڵ تیپی بەچکەشێرانی یانەی



سـان هێنریدا مەشـق بـکات، کـە یانەیەکـی نزیکـی ناوچـەی لاکاسـتێلان بـوو، ئـەو شـوێنەی کـە زیدان و خانەوادەکەی لێی نیشـتەجێبوون.

زیدان مـاوەی سـاڵ و نیوێکـی بـە شـێوەیەکی ڕێکوپێک لەگەڵ تیپەکـەدا بردەسـەر و هاوتەمەنەکانـی بـە "یـاز" بانگیـان دەکرد، کـە لـەو سـەردەمەدا زیـزۆ باشـترین و دیارتریـن یاریزانـی تیپەکـەی بـوو.

ڕۆژنامـەی لێکیپی فەرەنسـی لـە بـارەی ئـەو سـەردەمی زیدانـدا دەنووسـێت "ئـەو بـە ئامادەیی و کۆمەڵێک هونەری یارییەکـەوە. کـە لـە یاریگـەی قیـر و خۆڵـەوە فێـری ببـوو، ڕووی لـە تیپەکـە کردبـوو".

هەربۆیـە بەسـەر هاوڕێیەکانیدا سـەرکەوت، ئـەو ئەگـەر بەرگریکارێک، یـان دوو بەرگریـکار لێـی نزیکبوونایـەوە، ئـەوا ڕق و قینەیان بەرامبـەر زیـزۆ دەبوو، ئەمـەش بەهۆی بـاڵای بـەرزی و جەسـتەی بەهێزییـەوە.

ئەو بەهۆی قژە زۆرە ڕەشـەکەی لەوکاتدا، پێسـتە نەرمەکەی و سـتایلە عەرەبییەکـەی، دەتتوانـی لـە نێوان قژ زەردەکاندا بـە ئاسـانی جیـای بکەیـەوە، پێـش ئـەوە هـەر لـە گەنجیدا و لـە ژێـر ڕقـی خانـە بۆماوەییەکانـدا قـژی هەڵوەرێـت. ئـەو باڵابـەرز بـوو، ئـەو لـە گۆڵپارێزەکـەش باڵابەرزتـر بـوو، کـە بـە ئاسـتەم دەیتوانـی شـانی بگەیەنێتـە شـانی زیـزۆ، ئـەو

کاپتنی تیپەکە بوو، نیشانەی کاپتنییەکەی لە قۆڵی ڕاستی دەبەست، هێماکە، وەکو هێما مێژووییەکەی پلاتینی بوو، کە بە ئاڵای شین و سپی و سووری فەرەنسا نەخشێندرابوو، ئەو پلاتینییەی کە هەرگیز لە هزری گەورە و بچووکی فەرەنسییەکاندا دەرنەدەچوو، تاکو ئەوکاتەی زیزۆ مێخەکەکەی لە ژێر قاچی دەرهێنا و لە دیواری بیرەوەرییەکاندا خستییە خوارەوە.

زیدان لە مێردمنداڵیدا هێمای کاپتنی لە قۆڵی ڕاستی دەبەستا، کە دەبوو وەکو ناودارەکانی تۆپی پێ لە قۆڵی چەپیدا ببەستێت، بەڵام ئەو، ئەو کارەی نەکرد، تا ئەوکاتەی لە درەنگانێکی کاروانە زێرینەکەیدا هێمای کاپتنی لە قۆڵی چەپی بەست، وەکو بڵێی ئەو هێمایەی لەلای ڕاستی دەبەستا، سزای دابێت.

ڕەنگی درێسەکانی تیپی سان هێنری، سەوز و زەرد بوو، جلەکان لە هەموو وەرزەکاندا درێژبوون، جیاوازی لە نێوان هاوین و زستاندا نەبوو، ڕەچاوی کەشی سارد و خۆرەتاویشیان نەدەکرد، بەڵام زیدان هەمیشە درێسەکانی لە شۆرتەکەی ئازاد دەکرد، وەکو ئەوەی زۆر نارەزایی هەبێت.

بارەگەی یانەی سان هێنری چەند کیلۆمەترێک لە ماڵەکەیەوە دووربوو، زیزۆ بە پێ دەچوو و دەگەڕایەوە،

ساڵ و نیوێک بە پێ ڕۆیشتن، بە پێچەوانەی زۆربەی هاوڕێیەکانی لە تیپەکە، کە لەگەڵ باوکیان بە ئۆتۆمبێل، یان بە سواری پایسکلی خۆیانەوە هاتووچۆیان دەکرد، ئەم بارودۆخە کەسایەتییەکی خۆڕاگری بۆ زیدان دروست کرد، کە هەمیشە رقی لە شکست بێت و بە روویدا بوەستێتەوە.

باوکی زۆری هاندەدا و پاڵپشتی دەکرد و ئامۆژگاری و ڕێنمایی زۆری دەکرد لە بارەی ئەو ژیانە سەختەی، کە ئارامی ناناسێت، دایکیشی "مەلیکە" بە فێرکردنییەوە خەریکبوو، هیوای دەخواست لە زانست و خوێندندا سەرکەوتووبێت، بەڵام ئەو نەیدەزانی کوڕەکەی نەوەکو تەنیا سەرکەوتوو دەبێت، بەڵکو دەبێتە ئەفسانە و مامۆستایەک لە بواری کارەکەی خۆیدا، تەنانەت ئەگەر هەزار ساڵی دیکەش بژیت، هەمیشە دڵخۆش و ئاسوودە دەبێت، چونکە فەڕەنسییەکان هەمیشە بە باشە و چاکە باس لە کاروانی ئەو دەکەن، هەرچی گوتی و هەرچی ئەنجامی دا، کە نموونەی ئەو، قسەیان کەم بوو، بەڵام هەڵچوونی زۆر بوو.

زیدان حەزی دەکرد سەیری یاریی تۆپی پێ بکات، مۆندیالی 1982 یەکەم پاڵەوانیەتیی بوو، کە زیزۆ بە ڕێکوپێکی و ئاگاییەوە سەیری بکات، ئەو لەگەڵ براکانیدا

چاودێریی خشتەی یارییەکانی هەڵبژاردەی نیشتیمانیی یەکەمیان دەکرد، کە جەزائیر. کە لەو پاڵەوانیەتییدا بەشداربوو، ئەوان دڵخۆش بوون کاتێک تیپی رێوییەکانی بیابان، (ئێستا پێیان دەڵێن جەنگاوەرانی بیابان) خۆشییان خستە دڵی جەزائیرییەکانەوە، دوای ئەوەی لە داستانەکەی خیخۆندا بە دوو گۆڵی رابیح ماجەر و ئەخزەر بەللومی لە ئەڵمانیای رۆژئاوایان بردەوە، تەنانەت تیپەکە لە رێگە بوو بۆ گەیشتن بە قۆناخەکانی کۆتایی، ئەگەر ئەو پیلانگێڕییە نەبووایە، کە گوایە بەرامبەر جەزائیر کراوە لە نێوان ئەڵمانیای رۆژئاوا و نەمسادا، دوای ئەوەی نەمسا بە گۆڵێک بە ئەڵمانیا دۆڕا و هەردوو تیپ بەیەکەوە سەرکەوتن و جەزائیریش ماڵئاوایی لە پاڵەوانیەتییەکەدا کرد.

ئەوەی روویدا، هەردوو یاریزان بریگل و کرانکڵ دوای دوو دەیە و نیو لە رووداوەکە، دانی پێدادەنێن، لە دوای ئەم رووداوەش فیدراسیۆنی نێودەوڵەتیی تۆپی پێ (فیفا)، بڕیاریدا یارییەکانی گەڕی سێیەم لە قۆناخی کۆمەڵەکاندا لە مۆندیالەکاندا لە یەک کاتدا بەڕێوەبچن، بۆ ئەوەی هیچ پیلانگێڕییەک نەیەتە ئەنجامدان و هەوڵی یاریکردن بە ئەنجامەکان نەدرێت.

زیدان و براکانی هێشتا بەشدارییە دڵخۆشکەر و لە هەمان

کاتدا خامناکەکەی هەڵبژاردەی وڵاتی دایک (جەزائیر) یان بیر نەچووبوو، کەچی ئەمجارەیان شەقەزللەیەک لە لایەن ئەڵمانیای رۆژئاواوە لە روومەتی فەرەنسییەکانیش درا لە قۆناخی پێشکۆتایی پاڵەوانیەتییەکەدا.

دوای دوو ساڵ لەو ساڵە تاڵەی کە بەسەر فەرەنسا و جەزائیردا تێپەڕی، زیدان لە یادی لەدایکبوونی 12 ساڵەی تەمەنیدا، لەگەڵ براکانیدا خۆشییەکی یەکجار زۆریان بینی. دوای ئەوەی فەرەنسا لە قۆناخی پێشکۆتایی جامی ئەوروپای 1984دا لە پۆرتوگال بردەوە، لەو یارییەی کە لەسەر یاریگەی ڤیلدرۆم لە مارسیلیا کرا.

ئەوان لەسەر پەیژەکانی یاریگە بوون و چێژ و لەزەتیان لەو پاسەی تیگانا بینی، کە بۆ پلاتینی نارد و ئەویش بە تۆپێکی مووشەکئاسا گۆڵی تۆمارکرد.

دوای ئەمە، رۆژانێکی کەم تێپەڕین و فەرەنسا نازناوێکی کیشوەری بەدەستهێنا و جامی ئەوروپای بردەوە، خۆشی و شادیی زیدان و براکانی لەگەڵ هاوڕێیەکانیان لە گەڕەکەکەیاندا، بەم بۆنەیەوە، نە سنووری هەبوو، نە کۆتایی.

هاوکات دیاریی 12 ساڵەی لەدایکبوونی زیدان، پێڵاوێکی وەرزشی بوو بە ناوی "کوپا"، کە بە ناوی ئەفسانەی کۆچکردوو و پێشووی تۆپی پێی فەرەنسا "ریمۆن کوپا"

كرابوو، پێڵاوەكە زۆر نایاب بوو، بەڵام گرانبەهاش بوو، ئەوكات نرخەكەی 450 فرەنكی فەرەنسی بوو، كە دەیكردە نزیكەی 80 دۆلار، ئەم پارەیەش پرۆژەی پاشكەوتی ئیسماعیلی باوكی بوو لە ماوەی ساڵێكی تەواودا، زیدان دیارییەكە لەو كاتدا وەكو خەون باس دەكات، بەڵام لێدانێكی بە ئازاریش بوو لە گیرفانی باوكی. زیدان لە بارەی پێڵاوەكە دەڵێت "وایكرد زۆر ئاستبەرزبم".

# کەی زەنگەکە لێدەدات؟

"دەرهێنانی تۆپ لە نێوان قاچەکانیدا،
کارێکی نزیکی مەحاڵە".

ئا بەم شێوەیە فەرید باس لە بەهرەمەندی و بلیمەتیی برا بچووکەکەی دەکات لە تەمەنی منداڵی و مێردمنداڵیدا و دەڵێت: "ئەو هەرچەندە لە تەمەندا لە هەموومان بچووکتر بوو، بەڵام ئەو باشترین بوو، تاکە ئەستێرە بوو، کە جیاوازی لە نێوان ئێمە رکابەرەکانماندا دروست دەکرد و وایدەکرد سەرکەوتووبین، ئەو خۆی مەشق و یاریی دەکرد، هەر خۆی هونەرەکانی یاری فێردەبوو، پێش هەمووان دەهاتە یاریگە. دواتر هاورێیەکانی دەهاتن، ئەو بە بەردەوامی یاریی دەکرد، هیچ رۆژێک دانەدەبڕا".

هەستێکی پاک لە ناخی هەژاراندا هەیە، هیچ ئەرک و

فرمان و پەیوەستییەکیان نییە کاتێک تۆپ دێتە سەر شەقام، بە قاچەکانت هەرچی دەتەوێت بیکە. زیزۆ زۆر بایەخی بە قوتابخانە نەدەدا، ئەوکاتەی مامۆستاکانیشی لەگەڵ باوک و دایکی بەیەکدەگەیشتن، بۆیان دووپات دەکردنەوە، کوڕەکەیان لە ئەرک و فرمانەکانی خوێندندا دەستەوەستان نییە، بەڵام حەزیشیان لێناکات.

ئەو هەمیشە و زۆر بە توندی هۆگری ئەو کاتە بوو زەنگی چوونەوە بۆماڵەوە لێی دەدا، بۆ ئەوەی لەگەڵ هاوڕێیەکانی بەیەک بگەنەوە، کە بەسەر پۆلەکاندا پەرش و بڵاو ببوون، بە هۆی بەهرەمەندی و کارامەییشی لە یاریکردندا، زۆرجار مامۆستاکان بانگیان دەکرد بۆ ئەوەی لە کاتی پشوو و نانخواردندا لەگەڵ ئەواندا یاری بکات، بۆ ئەوەی چێژ لەو تامە وەربگرن، کە لە قاچەکانی دەردەچوو لە کاتی یاریدا، لە هەردوو قاچی راست و چەپیدا، هەر جارێکیش کە بانگیان بکردایە بۆ یاریکردن، یەکێک لە مامۆستاکانی، کە بایەخی بۆ تۆپی پێ هەبوو، ئەو دەستەواژانەی بۆ مامۆستا هاوڕێیەکانی دووبارە دەکردەوە، کە ئەو قوتابییە تەمبەڵە، یاریزانێکی سەرکەوتووە، بەهرەیەکی لەڕادەبەدەر سەرنجڕاکێشی هەیە، کە پێشتر کەس نەیبینیوە و دوارۆژێکی گەورە و پرشنگداری هەیە، ئەگەر بارودۆخە بە پێی ئارەزووی

تۆپ بڕوات!

توانای دارایی خانەوادەی زیدان و زۆربەی ئەو خانەوادانەی، کە لە گەڕەکی لاکاستێلاندا دەژیان، ئەو هەلەی بۆ نەدەڕەخساندن گەشت و گەڕان بکەن و پشوو وەربگرن، بۆیە مەینەتیی گەورەکان بۆ بچووکەکان سوودی هەبوو، هەلێکی بەنرخ بوو، لە ساڵێکدا تەنیا یەک جار بۆیان دەڕەخسا.

# بەشی دووەم

## "ئازیزم جان، ئێستا یاریزانێکی بلیمەتم دۆزییەوە"

### هەواڵی بەهرەمەندێك

ئەو منداڵەی، کە لە کاتژمێر 3ی بەرەبەیانیی رۆژی هەینی، 23ی حوزەیرانی 1972 لەدایکبووە، یانەی سان هێنری جێهێشت. کە کۆمەڵێک راهێنەری خۆبەخش سەرپەرشتیان دەکرد، ئەمەش دوای ساڵ و نیوێک یاریکردن لەوێدا.

هەردوو هاورێ نزیکەکەی، پییرۆ و مالیک، دەیانزانی کاروانی خۆشەویسترین هاورێیان لەگەڵ تۆپی پێدا بە شێوەیەکی کارا دەستیپێکرد، ئیتر زەوی بەدەوریدا



دەسوڕێتەوە، ئاسمان خۆی ئامادەکردووە بەم زووانە ئەستێرەی ئەو بدرەوشێنێتەوە، ئەمەش ئەم رۆژە ڕوویدا، کاتێک پەیامبەرێک هەواڵی بەهرەی زیدانی گەیاندە دیدەوانی دۆزینەوەی بەهرەمەندان و راهێنەری فەرەنسیی کۆچکردوو "ڕۆبێرت سێنتینیرۆ"، کە ئەویش لە لای خۆیەوە بە تەنیا پێشبڕکێی لەگەڵ کاتدا دەکرد، بۆ ئەوەی ئەو بەهرەمەندە ببینێت، کە پێی دەڵێن "زەینەددین"، چونکە ئەگەر پێی نەگات و لەدەستی بچێت، ئەوا زەرەرمەند دەبێت، ئەگەریش بەدڵنیاییەوە بەدەستی هێنا و دڵنیابوو، ئەوا براوە دەبێت.

سێنتینیرۆ، خۆی راهێنەری یانەی سیپتمیس لۆ ڤالۆس بوو، یەکێک لەو یانانەی لە گەڕەکەکانی باکووری مارسیلیا بوو، بەوەش ناسرابوو، یەکێک لە دۆزەرەوە زیرەکەکانی بەهرەمەندان بوو، چاوەکانی هەرگیز بێ هیوایان نەدەکرد.

لەوکاتەدا بەڕێز ئیسماعیل، باوکی زەینەددین، بێتاقەت و دڵتەنگ بوو بەهۆی پێشهاتێک، کە بەسەر کوڕەیدا هاتبوو لەگەڵ تیپی سان هێنریدا، ڕووداوەکەش بەم شێوەیە بوو، کە تیپی کوڕەکەی بەشداریی پاڵەوانیەتییەکی دۆستانەی کردبوو، کە هەموو یارییەکانی بە یەک رۆژ بەڕێوەدەچوو، زیدانیش پێش ئەو رۆژە زەحمەت

و سەختە، بە ئاستەم پشووی وەرگرتبوو، کەمێکیش خەوتبوو، بۆیە ڕووخساری ماندووبوونی پێوەدیاربوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە دوو یاریی سەرەتادا تیپەکەی بەرەو سەرکەوتن برد، کاتێکیش ئیسماعیل گەیشتە یاریگە و شوێنی بەڕێوەچوونی یارییەکان، کوڕەکەی بینی بێتاقەت و ماندووە و پەشۆکاوە، ئەمەش لە کاتێکدا بوو یاریی سێیەم دەستپێبکات. بەڵام باوکی زیزۆ لە بەردەم ڕاهێنەری تیپەکەدا وەستا و گوتی: "نەخێر نابێت".

باوکی بە زیدانی گوت: دەی کوڕم با بچینەوە ماڵەوە.

ڕاهێنەری تیپەکە بە تووڕەبوونەوە خەریک بوو لەگەڵ باوکی زیزۆدا بەگژیەکدابچن و پێی گوت: "ناتوانیت".

باوکە ئیسماعیل: بۆچی؟

ڕاهێنەرەکە بە تۆزێک پاڕانەوەوە: " بەبێ زیدانی کوڕت ئەم تیپە ناژیت و نامێنێت".

ئیسماعیل بەوپەڕی ئارامییەوە گوتی: "ئەو زۆر خراپە بۆ ئەم پاڵەوانیەتییە".

ئەمەی ڕستەی کۆتایی بوو، پێش ئەوەی دەستی کوڕەکەی بگرێت و بەرەو ماڵەوە بچێت.

تیپەکە بێ هیوا بوو، کاتێکیش بەبێ زیدان یارییان کرد پاڵەوانیەتییەکەیان دۆڕاند، بەڵام ئەم ڕووداوە پشکەکانی ئەو یاریزانە بچووکە تەمەن یازدە ساڵییەی بەرزکردەوە.

زیاتر لەوەی بە سیحری قاچەکانی لە تەواوی دەوروبەری پاڵەوانیەتییەکەدا، پەرشوبڵاوی کردبووەوە.
" رۆبێرت سێنتینیرۆ" ڕاهێنەر و دیدەوان، کە لە بەشی تیپە تەمەنە بچووکەکانی یانەی سیپتمیس کاری دەکرد، لەو ڕۆژەدا زیدانی بینیبوو، چاودێری کردبوو، سەرنجی دابوو، بڕوای بەو قسەکانی ئەو کەسە هات، کە هەواڵی بەهرەی ئەم منداڵەی پێدابوو، چێژی لە کارامەیی سەرکەوتووی ئەو بینیبوو، بۆیە پلانی دارشت گرێبەستێک لەگەڵ ئەم منداڵەدا واژووبکات، ئەو منداڵەی ناز دەداتە تۆپ، وەکو چۆن باوکێک ناز دەداتە منداڵە تازە لەدایکبووەکەی.
ڕۆژی دواتر، رۆبێرت سێنتینیرۆ بە سواری ئۆتۆمبێلە بیجۆ بچووکەکەی، کە لە جۆری 104 و سەری کراوە بوو، بە خێرایی بەرەو گەڕەکی لاکاستێلان بەڕێکەوت و بەدوای کەسێکدا دەگەڕا بیگەیەنێتە ماڵی زیدان، کاتێکیش گەیشتە ماڵەکە، لەگەڵ نورەددینی براگەورەی زیزۆ بەیەکگەیشتن و ڕێککەوتن بەیەکەوە دابنیشن، ئەمەش ڕوویدا و هەردوولا بۆ ماوەی یەک کاتژمێر دانیشتن و بەرهەمەکەی ئەوەبوو، کە خانەوادەی زیدان ڕازیبوون کوڕەکەیان پەیوەندی بە یانەی سیپتیمسەوە بکات، کە لە گەڕەکەکەیان زۆر دوور نەبوو.
سێنتینیرۆ کارگێڕیی یانەکەی ڕازیکرد، زۆر بە فراوانی

باسی یاریزانەکەی کرد، ئەوەی گوت و گێڕایەوە، باسی ئەو دروشمانە کرد، کە لەسەر دیڕەکانی یاریگە دەینەخشێنێت، ئەو چیرۆکانەی، کە بە مەرەکەبی تۆپ دەینووسێتەوە، ئەو پەیکەرە سەرنجڕاکێشانەی، کە بە ئەملاو و ئەولای پێڵاوەکانی دەیتاشێت.

ئامانج و داواکارییەکەی راهێنەرە دۆزەرەوەکە هاتەدی و زیدان بە درێسی یانەی سیپتیمسەوە رازایەوە.

کاتێکیش سێنتینیرۆ بۆ یەکەمجار لە گەڕەکی لاکاستێلانەوە زیدانی بەرەو یەکەم یەکەی مەشقیی تیپە نوێیەکەی برد، تایەکی ئۆتۆمبێلەکەی لە رێگەدا تەقی، بەڵام بە خێرایی چارەسەری کرد، بۆ ئەوەی یاریزانە بەهرەمەندەکەی لە یەکەم مەشقدا دوانەکەوێت، زیدانیش لە راستیدا شایەنی زۆر لەوە زیاتر بوو.

راهێنەری تیپە نوێیەکەی زیزۆ، ناوی کێنتینیرۆیە، ئەو بە گشتی یاریزانەکانی خۆی خۆشدەوێت، بە تایبەتی ئەو بەهرەمەندانەی، کە خۆی بەهرەی دۆزیبوونەوە، لەوەش راهاتبوو کە بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی هاتووچۆی نێوان ماڵەوە و یاریگەیان پێ بکات و بە پێچەوانەشەوە.

قۆناخی تیپی سیپتمیس لە کاروانی زیداندا، قۆناخێکی یەکلاکەرەوە بوو، وەکو پردێک بوو بۆ ئەو بەرەو یانەکانی دیکە، پردێک بوو بۆ ئەو، بەرەو دۆزەرەوە و

راهێنەرانی دیکە.

زیزۆ لەگەڵ تیپی بێچووەشێرانی ئەو یانەیەدا یاریی کرد، تاکو تەمەنی 14 ساڵی.

# لە ماڵی سەرۆك

یاریکردن بۆ یانەی سیپتمیس ئاسۆی گەورەی لە بەردەم زیزۆدا کردەوە، هەلی ئەوەی بۆ رەخساند بەرەو دەرەوەی سنوورەکانی مارسیلیا و بەشەکانی دیکەی فەرەنسا هەنگاو بنێت، بەرەو ئالپ و پیرینێجنان، ئەوکاتەشی کە تەمەنی 13 ساڵ بوو. بۆ ماوەی سێ رۆژ بانگهێشتی کەمپی مەشقی هەڵبژاردەی تازەپێگەیشتووانی فەرەنسا کرا بە هۆی راهێنەر گیلیس رامبیلۆنەوە، کە زیدانی بە گەوهەرێک وەسف کردووە بە هیچ نرخێک لە کڕین نایەت.

مەشقەکانی هەڵبژاردەی تازەپێگەیشتووانی فەرەنسا لەو سێ رۆژەدا لە بنکەی ناوەندیی کرێبس بوو، بنکەی هەرێمیی وەرزش و پەروەردەی جەستەیی لە شاری ئاکس ئان پرۆڤێنس، کە دەکەوێتە کەناراوەکانی مارسیلیا

و یەکێکە لەو بنکە و پەیمانگەیانەی، کە لە ڕێگەی یەکێتیی تۆپی پێی فەرەنساوە بەڕێوەدەبردرێن و سەرپەرشتی دەکرێن.

زیدان لە کەمپە مەشقییەکەدا ئەستێرەی بێ ڕکابەر بوو. بە ڕێککەوتیش جان ڤارۆد، ڕاهێنەر و دۆزەرەوەی یاریزانان لە یانەی دێرینی (کان) لەوێدا ئامادەبوو، سەرنجی کەوتە سەر زیزۆ، دووچاری سەرسوڕمان بوو.

ئەو لە بارەی زیدانەوە دەڵێت "یاریزانێکی شکۆدارە، دوو دەستی هەیە وەکو قاچەکانی". ڤارۆد بە خێرایی تیشک کەوتە تۆڕی زیدانەوە، سەرنجی هەڵسوکەوت و شێواز و کارامەیی دا، هەستی بە برسیەتی و حەزی کراوەی ئەوی بۆ سەرکەوتن کرد.

جان وەسفی ئەو دیمەنانە دەکات "خێرا زانیم بەرامبەر یاریزانێک وەستاوم، کە دەبێتە باشترینی گۆی زەوی. خێراییەکی نائاسایی و دەگمەنی لە قاچەکانیدا هەیە، شتێک، نە پێشتر دیبووم و نە دواتریش بینیم، وەکو جەنگاوەرێک دەمبینی، لەوەش زیاتر دڵنیابووم، کاتێک زانیم هەژارە و لە ناوچەیەکی مەترسیداردا دەژیت".

ڤارۆد لەو کاتدا پەیوەندییەکی تەلەفۆنیی خێرای بە ڕاهێنەری یانەی کان کرد و پێی گوت: "ئازیزم جان، ئێستا یاریزانێکی بلیمەتم دۆزییەوە".

ڤارۆد زیدانی بردە شاری کان، خستییە نێو مەشقێکی تاقیکاری کورتەوە، کە ماوەکەی 6 هەفتە بوو، بۆ ئەوەی دڵنیابێت ئەو منداڵەی، کە سەرسامی کردووە و بە سروشتی بەهرەمەندە، دەتوانێت ئەو تۆپانەی لە ژێر قاچەکانیدایە، بیگوازێتەوە بۆ یاریی جادووگەرانە لە پێش چاوی راهێنەر جان فێرناندێزدا.

زیزۆ ئەمەی بە بلیمەتی ئەنجام دا و فێرناندیزی راهێنەر بە تواناکانی ئەو سەرسام بوو، کە جەزائیر خاڵی هاوبەشی نێوانیان بوو، چونکە فێرناندیز لە 1954 لە جەزائیر لەدایک ببوو، پێش ئەوەی باوکە راوچییەکەی پێش سەربەخۆیی جەزائیر ئەو وڵاتە جێ بهێڵێت، کە ئەو کات تەمەنی 8 ساڵان بوو.

فێرناندیز پێی سەیر بوو، چۆن راهێنەران و دیدەوانەکان رێگەیان بەرەو زیدان ون کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوکات هەستی کرد یەک کێشەی هەیە، ئەویش لە لێدانی سەردا لاوازە، ئەمەش لەبەر ئەوەی لە گەڕەکی لاکاستێلان و لەسەر یاریگەی تارتاندا مەشقی لەسەر نەکردبوو، بەڵام ئەمە کێشەیەکی بچووک بوو، چارەسەرکردنی ئاسان بوو بە بەراورد لەگەڵ کێشە گەورەکەدا!

کێشە گەورەکە ئەوەبوو، زیدان تەمەنی لە ژێر 18 ساڵیدا بوو، رێگەی گواستنەوەی بۆ یانەی کان پێنەدەدرا، تەنیا

بە ڕەزامەندیی خانەوادەکەی نەبێت.
لەمبارەیەوە مەلیکەی دایکی زیزۆ دەڵێت "کوڕەکەی منیان دەویست، بەڵام من ئەوکات ڕازی نەبووم، چونکە هێشتا بۆ سەفەرکردن و دوورکەوتنەوە بچووک بوو".
بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، باڵاترین دەسەڵات هاتە پێشەوە. سەرۆکی یانەی کان، جان کلود ئێلینۆ، کە خانەوادەی زیدانی ڕازی کرد بەوەی کوڕەکەیان دەباتە ماڵەکەی خۆی و وەکو کوڕە تاقانەکەی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، دیمەنێکی زۆر دەگمەن بوو، پێشتر ڕووینەدابوو یاریزانێک لە ماڵی سەرۆکی یانەکەیدا بمێنێتەوە.
خانەوادەکەی بە نابەدڵییەوە بە جیابوونەوەی کوڕە بەنازەکەیان ڕازی بوون.
سەرەڕای ئەو پێشوازییەی لە ماڵی خانەوادەی ئێلینۆ لێی کرا و ئەو باوکایەتییەی پێی دەبەخشرا و ئەو جیاوازییەی بۆ ئەو دەکرا لەگەڵ ئەو 20 یاریزانەی کە وەکو ئەو بوون و لە بارەگەی یانەکەدا شوێنیان بۆ دابین کرابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سروشتیی بوو نقوومی خەم و ئازار بێت بۆ دابڕانی لە خانەوادەکەی، کە 200 کیلۆمەتر لێیانەوە دووربوو، چونکە بە ڕاستی ئەو تەمەنی بچووک بوو، زۆریش هۆگری دایک و باوک و براکانی، هەروەها

ئەو شوێنە جوان و لە هەمان کاتدا ناشیرینەش بوو، کە لەوێدا ئێسکەکانی گەشەیان کردبوو.
زیدان ئاماژەی بەوە دەکات، دوای ماوەیەکی کورت زۆر بیری کەسوکاری کردووە، دووچاری سەختیی زۆر بووە و زۆر تامەزرۆی گەڕانەوە بووە بۆ باوەشی خانەوادەکەی ، بۆیە لە کابینەیەکی نزیکی ماڵە نوێیەکەیدا، تەلەفۆنی بۆ ماڵەوە کردووە، بەڵام بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو گەورەیی و ئازایەتییەکی گەورەی پیشانداوە وەکو پیاوێکی پێگەیشتوو.
زیزۆ باسی ئەو کاتانە دەکات "بەرامبەر بارودۆخی خۆم دەستەوەستان بووم، داماو و خەمبار بووم، چونکە ئەوانەم لەدەست دابوو، کە گرنگن بوون لە ژیانمدا، باوک و دایکم، براکانم و هاوڕێیەکانم، هەموو شەوێک بە بێدەنگی لەسەر جێگەکەم دەگریام و بە فرمێسکەکانم سەرینەکەمم تەڕ دەکرد، تەواوی ساڵێک، هەوڵمدا بگەڕێمەوە بۆ لایان، بەڵام هەر لەو کاتدا بە خۆمم گوت، پێویستە خۆڕاگربیت و بەرگری بکەیت، ئارام و بەرگە بگریت لە پێناو ئەو سەرکەوتنەی، کە هەوڵی بۆ دەدەی".
لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا، زیدان بەرامبەر هەستی خامناک و بیرکردنی کەسوکارەکەی، بەرگری پەیداکرد، یان راستتر بڵێین لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا کەوتە ململانێیەوە

و بەسەریدا سەرکەوت، بە جۆرێک لە ژیان و مانەوەی لە ماڵی جان کلود ئیلینۆدا جۆرێک لە هاوسەنگی و جێگیریی دەست کەوت، ببووە یەکێک لەو ئەوان، چێژی لە خواردنی تایبەتی ئێوارانی چوارشەممە وەردەگرت، کە هاوژینی ئیلینۆ ئامادەی دەکرد، ئەویش پەتاتە و نان، کە زیدان وەکو باسی دەکات، لەسەر شێوازێکی تایبەت بوو.

هەستی باوکایەتی و بایەخپێدانی ئیلینۆ بۆ زیدان، یەکێک لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی ئەزموون و ئەو قۆناخی ژیانی زیزۆ بوو، زۆر لە ئازارەکانی ئەوی کەمکردبووەوە، بە تایبەتی دووری لە خانەوادەکەی.

ئیتر زیدان پەیوەندیی هاورێیەتی لەگەڵ یاریزانەکانی یانەی کان دروست کرد، کە زۆربەیان لە کۆچبەرەکانی باکوور و باشووری ئەفریقا بوون، هەروەها لە ئەرمینیا و ئیتاڵیاوە بوون، تەنانەت هەندێکیان لە مارسیلیای زێدی ئەویشەوە هاتبوونە یانەکە.

هەر لەو شارەشدا کچێکی گەنجی ناسی، کە لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکاندا دەیخوێند و بە رەسەن ئیسپانی بوو، هەردووکیشیان دووربوون لە خانەوادەکانیان، هەرچەندە زیدان بەرامبەر کچان دەستی دەلەرزی و ئازایەتی نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەو کچەدا جیاواز بوو.

زیزۆ لە بارەی ترسنۆکیی ئەو کاتی بەرامبەر کچاندا دەڵێت "قسەکردن لەگەڵ ئەواندا، وەکو ئەوە وابوو بچیتە زیندانەوە".

زیدان کەوتە داوی خۆشەویستی و جوانیی کچە ئەندەلووسییەکە و دڵ و هۆشی کەوتە لای ئەو، ئیتر هەر کاتێک بۆی بڕەخسایە و کاتی هەبووایە، دەیبینی و بەیەک دەگەیشتن، هەرچەندە کچەکە دوو ساڵیش لە ئەو گەورەتر بوو.

خانەوادەی کچەکە لە شارۆچکەی بچووکی رۆدز دەژیان، کە ژمارەی دانیشتووانەکەی لە 30 هەزار کەس تێنەدەپەڕی، ئەو شارۆچکەیە سەر بە شاری ئەڤیرۆن بوو لە باشووری فەڕەنسا، هاوکات خانەوادەی کچەکە بە رەگ و ڕیشە خەڵکی گوندی شیڤیی دەوروبەری شاری ئەلمیریای ئەندەلووس بوون لە ئیسپانیا، کە دەکەوێتە سەر دەریای ناوەڕاست، ئەو شارەی کە لەسەر دەستی عەبدولڕەحمانی سێیەم، میری کۆردۆبا (قورتوبە) لە ساڵی 955ی زایینی دروستکرا.

کچەکە ڤیرۆنیکایە، (کە ئێستا هاوژینی زیدان و دایکی چوار کوڕەکەیەتی)، کە ئەوکات هاتبووە شاری کان بۆ ئەوەی لە ئەکادیمیای هونەر و لە بەشی سەمای کلاسیکی و گوازرشتی بخوێنێت و ئاواتی ئەوەبوو ببێتە

مامۆستای ئەم هونەرە، لە تەک ئەوەدا لە زانکۆشدا زانستی بایەلۆجی دەخوێند، کە ئەوکات تەمەنی 19 ساڵ بوو، لە بەرامبەردا زیدان تەمەنی 17 ساڵ بوو.
رابردووی خانەوادەی ڤیرۆنکیا و زیدان زۆر لەیەکەوە دوورنەبوو، بە جۆرێک جگە لە کۆچکردن، هەژارییش خاڵی هاوبەشی نێوانیان بوو.

## سەربازیی بە زۆرەملێ

خزمەتی سەربازی لەسەر لاوانی فەڕەنسادا فرمان بوو، وەکو زۆربەی وڵاتانی دیکە، بە تایبەتی رووسیا، هەنگاریا، کە ئەوکات سەر بە نەمسا بوو، ئەمەش لە دوای دوو جەنگی جیهانی، کە مرۆڤایەتی ماندوو و وێران کرد، کە ئەوکات پێیان دەگوت "خزمەتی نیشتیمانی".

سەرەتاکانی خزمەتی سەربازیی زۆرەملێ لە فەڕەنسا، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەیەمی زایینی، بە دیاریکراوی لە ساڵی 1798، کە ئەوکات خزمەتی سەربازی لە نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیەدا لە 5 ساڵ کەمتر نەبوو، دوای ئەمە بە بارودۆخی سیاسی و سەربازییەوە پەیوەست بوو، کە لە نێوان 5 تاوەکو 6 ساڵ بوو، پێش ئەوەی بۆ 8 مانگ کەمبکرێتەوە، راکردنیش لە خزمەتی سەربازیدا، خاوەنەکەی دەخستە بارودۆخێکی سەختەوە، کە وەکو راکردن لە خزمەتی نیشتیمان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا و

کۆمەڵێک سزایان بەسەردا دەسەپاند.
ئەوکاتەی زیدان تەمەنی گەیشتە 18 ساڵ، بۆ خزمەتی سەربازی بانگ کرا، هەروەکو پلاتینی، کە ئەویش لە هاوینی 1975 خزمەتی سەربازی بەجێ گەیاند، تەنانەت زۆربەی ئەستێرەکانی وەرزش لە فەرەنسا بە هەمان شێوە بوونە سەرباز، لەوانە هاوڕێیانی پلاتینی لە یانەی نانسی "جان میشێل مۆتێر، ئۆلیڤەر رۆیەر و ماکسیم بۆسیس".
هەر لەو وەرزدا یانەی نانسی زۆر زەرەرمەند بوو بەهۆی بەشدارینەکردنی پلاتینی لە یارییەکانیدا، تەنیا لە چەند یارییەکی کەمدا بەشداربوو، بۆ ئەمەش رەزامەندی لە بەرپرسانی سەربازگەکەی وەردەگرت، بەرپرسانی سەربازگەکەش بەشێکیان دروست کردبوو بە ناوی "جوانفێل" کە تایبەت بوو بەو وەرزشوانە بەهرەمەندانەی کە وەفاداربوون بە ئەنجامدانی خزمەتی سەربازییەوە. ئەم بەشە سەربازییەش، هەمان بەش بوو، کە زیزۆ لە ساڵانی نەوەدەکانەوە پەیوەندی پێوەکرد، کە پێشوازییەکی گەرمیان لێ دەکرا و مامەڵەیەکی تایبەتیان لەگەڵدا دەکرا، هەر لەو کاتەشدا زیدان رۆژانە نزیکەی 10 جار لەگەڵ ڤیرۆنیکای هاوڕێی قسەی دەکرد.
فەرەنسا لە ساڵی 2002 و دوای 204 ساڵ، خزمەتی

زۆرەملێی سەربازی وەستاند، ئەمەش بەهۆی بڕیاری سەرۆکایەتیی ژمارە 133، هاوشان لەگەڵ وڵاتانی ئیتاڵیا، ئیسپانیا و پۆرتوگال، کە لە ژێر سێبەری ئاشتیدا، بڕیاری خزمەتی زۆرەملێی سەربازییان خستە نێو زبڵدانی مێژووەوە.

# بەشی سێیەم

## "لێرەدا قژی هەڵوەری"

### یاریکردن لەگەڵ گەورەکاندا

جان فێرناندیزی راهێنەر نەیتوانی زۆر چاوەڕێی بەهرەمەندیی زیزۆ بکات و لە تەمەنی 17 ساڵیدا بۆ تیپی یەکەمی یانەی کان سەریخست. یەکەم یارییشی لە 18ی ئایاری 1989 بەرامبەر یانەی نانت ئەنجام دا، کە لەسەر یاریگەی ئەمەی دواییدا بوو، زیزۆ لە یارییەکەدا وەکو یاریزانی ناوەڕاست و یاریساز، بەرامبەر بەرگریکاری زەبەلاح مارسیل دۆسایی و ئەستێرەی ناوەڕاست دیدیێ دیشامپ یاریی کرد، بە کارامەییەکی زۆرەوە یاریی کرد، کە جان فێرناندێزی راهێنەر بە "کارامەییەکی پیرۆز"

ناوی دەبات.

سەرەڕای بەشدارییەکی کورت لە یەکەم یاریدا، بەڵام 5 هەزار فرەنکی فەرەنسی وەکو پاداشت و پاڵپشتی وەرگرت، کە چەند بارەی ئەو برەپارەیە بوو، کە لە مانگەکانی سەرەتای پەیوەندیکردنی بە یانەی کانەوە وەریدەگرت.

لویس فێرناندێز، ئەستێرەی یانەی کان لە بارەی هاوڕێ گەنجەکەیەوە دەڵێت "ئەو هەمیشە مەشقەکانی بەبێ وەستان و ماندووبوون دووبارە دەکردەوە، ئارام بوو، پەلەی لە رۆیشتن نەبوو، چێژی لە مەشقەکان و یاریکردن بە تۆپ وەردەگرت، لە هەمووومان زیاتر تینووی فێربوون و پێشکەوتن بوو".

هەروەها دەڵێت "کاتێک لە لایەن بەرگریکارانی تیپە رکابەرەکانەوە لێی دەدرا، هەمووومان بە توندی بەرگریمان لێدەکرد، نەماندەویست هیچ زەرەرێکی پێ بگات و کەس ئازاری بدات، چونکە دڵمان لەلای بوو، ئەو ئەستێرە بچووک و بەهرەمەند و نایابەکەی ئێمە بوو".

زیدان لە لای خۆیەوە لە بارەی شەوی دوای یارییەکە دەڵێت: "ئەو رۆژە زانیم تۆپی پێ شەیدایی و حەزی ژیانی منە، بڕوام بەوە هێنا دەتوانم شتی زۆر لە کاروانی خۆم لەگەڵ تۆپی پێدا بەدەست بهێنم، ئەمەش بە هۆی

سووربوون و کارکردن و خۆڕاگرییەوە".

هەر سەبارەت بەو پێشهاتە، ئیسماعیلی باوکیشی زۆر خۆشحاڵ بوو، زۆر بە سادەییش دەڵێت "خەڵک ڕێزت دەگرن و خۆشیان دەوێی، کاتێک تۆش هەمان هەستت بۆ ئەوان دەبێت".

زیزۆ لە وەرزی 1988- 1989 تەنیا دوو یاریی ئەنجام دا، ئامانجیش زیاتر تواندنەوەی بەستەڵەکی ئەو ترسە بوو، کە لە ناخیدا هەبوو، بەهۆی ئەوەی هێشتا بچووک و لە تەمەنی 17 ساڵیدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی بەشدارییەکانی لەگەڵ تیپی لاوانی یانەکەیدا بوو.

دواتر خزمەتی زۆرەملێی سەربازی لە وەرزی 1989- 1990 بێ بەشی کرد و لەو وەرزدا هیچ یارییەکی نەکرد، ئەمەش سروشتیی بوو، تەنانەت هەمان بارودۆخ بەسەر میشێل پلاتینییشدا هاتبوو لە ساڵی 1975دا.

لە وەرزی سێیەمیدا لەگەڵ یانەی کان 1990-1991 زیدان 31 یاریی کرد و 1 گۆڵیشی تۆمارکرد، بەڵام پشکی شێری لە دروستکردنی ئەو 32 گۆڵەدا بەرکەوت، کە تیپەکەی تۆماری کردبوو، یەکەم گۆڵیشی لە تۆڕی یانەی نانت لە 8ی شوباتی 1991دا لە خولەکی 56دا تۆمارکرد، کە ئەو ڕۆژە یارییەکەیان بە ئەنجامی 1-2 گۆڵ بردەوە، لە دوای یارییەکە و لە کاتی ئاهەنگگێڕانی یاریزانان و



ستافی مەشق، سەرۆکی یانەی کان، بەڵێنەکەی خۆی جێبەجێکرد، کە بە زیدانی دابوو. ئەویش ئۆتۆمبێلێکی مۆدێل نوێی رینۆ، جۆری کلیۆ بوو. زیدانیش لە لوتکەی دڵخۆشیدا بوو، کە دوای ئەوەی بە هۆی ئاستبەرزییەوە رۆڵی هەبوو لە گەیاندنی تیپەکەی بە پلەی چوارەمی ریزبەندی، وەکو باشترین ریزبەندی تیپەکە لە دوای دابەزینی بۆ پلە دوو لە وەرزی 1948-1949، بەڵام زیزۆ ئەمجارەیان رۆڵی هەبوو لە گەیاندنی تیپەکەی بە خولەکانی ئەوروپا بۆ یەکەمجار لە مێژووی یانەکەدا.

زیدان سەرنجی هەموو لایەکی راکێشابوو، وەکو یاریزانێک، کە جەماوەر خۆشیان دەوێت و پشتیان پێ دەبەست، هەروەکو چۆن راهێنەر و یاریزانانی هاوڕێی پشتیان پێ دەبەستا. ئەو ساڵە ساڵێکی گرنگ بوو، یەکەم ساڵی پیشەگەرانەی زیزۆ بوو بە شێوەیەکی کارا، کە هەر لەو وەرزدا زیزۆ لەگەڵ هێرشبەری سەنیگالی ئامارا سێمبا دووانەیەکی ترسناکیان لە تیپەکەدا دروست کردبوو، کە ئاماراش بە شێوەی خواستن لە پاریس سانجێرمانەوە رووی لە کان کردبووو.

بەڵام پێش ئەوەی ئەم دووانەیە سەرکەوتنی گەورە و زیاتر بەدەست بهێنن، لە وەرزی دواتردا 1991-1992 سێمبا گەڕایەوە پاریس سانجێرمان و تیپەکەش وەکو

مەلێکی باڵشکاوی لێهات و وەرزەکەیان بە بارودۆخێکی خراپدا تێپەڕاند و لە پلەی 19دا گیرسانەوە.

وەرزەکە بۆ زیدانیش دوورودرێژ و پڕ ماندووبوون بوو، کە 38 یاریی تێدا ئەنجام دا و 5 گۆڵیشی تۆمارکرد، سەرەڕای ئەوەشی تیپەکەی ئاستی باش نەبوو، بەڵام زیزۆ لەو وەرزدا ئاستبەرز و سەرکەوتووبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەستی بە بێ هیوایی دەکرد بەهۆی دابەزینی تیپەکەی بۆ پلەیەک نزمتر.

لەگەڵ ئەوەشدا دەرگەکانی بەڕوودا کرایەوە بۆ ئەوەی تیپە هیوابڕاوەکەی جێ بهێڵێت و هەردوو یانەی مارسیلیای زێدی و بۆردۆ کەوتنە ململانێیەکی توندەوە بۆ بەدەستهێنانی تواناکانی زیزۆ، لە کۆتاییدا ئەستێرە لاوەکە پەیوەندیی بە یانەی بۆردۆوە کرد، کە گەڕابووەوە خولی پلە یەک، دوای ئەوەی پێشتر دووچاری کارەساتی دابەزین ببوو.

لەگەڵ ئەو پێشهاتەدا هەندێک لە ڕۆژنامەنووسان بە هەستێکی ئاوێتە لە ڕەگەزپەرستی دژایەتییان کرد و ڕەخنەی توندیان ئاڕاستە کرد و بە "لەخۆبایی" وەسفیان کرد، بەڵام ئەو گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی ڕاهێنەر "جی لاکۆمپ" بوو، کاتێک پێی گوت: "لە ئێستاوە تاوەکو کۆتایی کاروانی وەرزشیت تۆ ڕووبەڕووی مەینەتی



قورس و لێدانی بەهێز دەبیتەوە، ئەمە هەمیشە لەگەڵ یاریزانە بەهرەمەندەکان روودەدات، ئەگەر تۆش خۆت بەدەستەوە بدەیت، ئەوا دەکەویتە پەراوێزەوە و دەبێت سەیری یاریزانانی دیکە بکەیت".

# سەما لەگەڵ تۆپ

بەشداریکردنی سەرەکیی زیدان لە وەرزی 1991-1992 وایکرد کۆمەڵێک بیروبۆچوون و تێبینی لەلایەن شارەزایانی تۆپی پێ لە فەرەنسا لە بارەی ئەوەوە بخرێنەڕوو، هەندێکیان رەخنەیان لە شێوازی یاریکردنی هەبوو، بەڵام دووپاتی ئەوەیان دەکردەوە، کە بلیمەتە، بەڵام زۆر بایەخ نادات، یان زێدەڕۆیی دەکات، یان جۆرێک لە سستیی تێدایە، گۆڵی کەم تۆمار دەکات و هەندێک جار پاس دەدات لە کاتێکدا دەتوانێت شووت بکات، ئەمەش لە راستیدا بۆ یاریزانێکی ناوەڕاست و یاریساز نەنگی نییە. یەکێک لە راهێنەرەکان گوتی، ئەو بە شێوازێک یاریی دەکات، کە پێشتر نموونەی نەبووە، لەگەڵ تۆپدا سەما دەکات، لەنجە دەکات و جەماوەر بە جوولانەوەی "خولانەوەی 360 پلە" سەرسام دەکات، کە خۆی دایهێناوە

و لەسەر یاریگەی تارتانی لای ماڵەکەی خۆیانەوە فێری ببوو، هیچ یاریزانێک وەکو ئەو ناتوانێت ئەو جوولانەوەیە بکات و یاریزانانی رکابەریشی پێشبینیی ئەوەی لێ ناکەن کاتێک رووبەڕووی دەبنەوە.

نووسەر و رۆژنامەنووس جان فیلیپی، کە زیدانی لە سەرەتاکانییەوە بینیوە، دەڵێت: "ئەو بە جۆرێک یاریی بە تۆپ دەکرد، وەکو ئەوەی سزای زیندانی هەمیشەیی بۆ بڕابێتەوە، زۆر بە بڕواوە پێیەوە پەیوەست بوو، شێوازی یاریکردنیشی کۆن نەبوو، شێوازێک نەبوو وازی لێ هێنرابێت، بەڵکو شێوازێکی هاوچەرخ بوو".

هەروەها دەڵێت: "ئەو یەکێکە لەو یاریزانە دەگمەنانەی، کە دەتوانن یاریی بکەن بە شانۆگەرییەکی سەرنجڕاکێش".

زۆرێک پێشبینیی ئەوەیان دەکرد ئەو یاریزانەی، کە تازە و بە گرێبەستێکی چوار ساڵە پەیوەندیی بە یانەی بۆردۆوە کردبوو، دەبێتە هیوای هەڵبژاردەی فەڕەنسا، دەبێتە سەرکردەی تیپەکە و وڵاتی خەونەکانیان و پردی گەیشتن بە ئاواتەکانیان، زیزۆش لە لای خۆیەوە سوپاسی باوکی کرد، سوپاسی جان فێرناندێز و ڤارۆدی دۆزەرەوەی کرد، کە بەهرەی ئەویان نرخاند و هەلی ئەوەیان بۆ رەخساند درێسی ژمارە 21ی یانەی کان بپۆشێت.

لەو دوو ساڵەشی، کە وەکو یاریزانێکی سەرەکیدا لەوێ بوو، کەسایەتی و ناسنامەی خۆی دروست کرد، رووخساری بەهرە و تواناکانی دیارکەوتن، بەرەو پێگەیشتن چوو. زیدان ئەو ماوەیەی لە بیر ناچێت، چاکەی ئەو تیپەی لە بیر ناچێت کە ماوەی شەش ساڵ لەوێدا یاریی کرد، کە سێ ساڵی وەکو یاریزانێکی تازەپێگەیشتوو بوو، لەوێدا فێربوو لە ژووری جلگۆڕیندا شەق لە کەلوپەلەکان نەدات، کاتێک یارییەک دەدۆڕێنن، چونکە سەرکەوتن بەڕێوەیە و هیچ گومانی تێدانییە، هەرچەندەش بە دوایدا بگەڕێی، ئەوا سەرەوەرییەکان هەرگیز دوانەکەون، ئەگەر سووربوون ون نەبێت و بە بەهێزیی رۆحەوە پەیوەست بێت.

زیدان بە پارە هاوکاریی ماڵەوەی دەکرد، ئەو بۆ ئاندریۆ ئانتۆنیی رۆژنامەوانی ڕۆژنامەی گاردیانی بریتانی قسە دەکات و ئەوە باس دەکات، یەکەم پاداشت کە لە یانەی کانەوە وەریگرت، دوای ئەنجامدانی یەکەم یاری، راستەوخۆ بۆ باوک و دایکی ناردووە لە مارسیلیا.

گەوهەرەکەی تۆپی پێی فەڕەنسا، دوای ئەوە، هاوشان لەگەڵ یاریزانی بەتوانای باڵی چەپ لیزارازو، هەروەها هاوڕێی خۆشەویستی کریستوف دوگاری، پەیوەندییان بە یانەی بۆردۆوە کرد، زیزۆ دریێسی ژمارە 7ی وەرگرت.

هاتنی زیدان بۆ بۆردۆ لەسەر داوا و سووربوون و ململانێی توندی راهێنەر رۆلان کۆربس بوو، کە ململانێی چەند یانەیەکی کرد بۆ بەدەستهێنانی زیزۆ، کۆربس خۆی لە مارسیلیای زێدی زیدان بوو، چەند ساڵێک بوو زۆری لە بارەی ئەو یاریزانەوە دەبیست، بۆیە ئەو هەلەی بۆ هاتەپێش بیباتە تیپەکەیەوە، هەلێک کە دووبارە نەدەبووەوە، رۆلان لە کارەکەیدا سەرکەوتووبوو، تیپێکی نایاب و سەرنجڕاکێشی دروست کرد، بەڵام ئەوەندەی سەرنج و سەرسامیی فەرەنسی و ئەوروپییەکانی بەدەستهێنا، ئەوەندە نەیتوانی بگاتە سەر سەکۆی سەرکەوتن و بردنەوەی نازناوەکان.

کریستۆف دوگاری لە بارەی ئەو رۆژانەی بۆردۆ و ناسینی زیدانەوە دەڵێت: "پێم وابوو یاریزانێکی ئاساییە، لەسەر پەنجەی پێی هاتبووە شوێنێک کە هەستی ناوبانگ و ئەستێرەبوونی لێ دەکرد".

دوگاری هەروەها دەڵێت: "نزیکەی مەحاڵ بوو ببین بە هاوڕێ، مەزاجی بوو، کەم متمانە بوو، بە ئاسانی خەندە و متمانەی پێ نەدەدای، بەڵام هاوژینەکانمان دوو هاوڕێی لەیەکگەیشتوو بوون، بۆیە دوای ئەوە هاوڕێیەتیم لەگەڵ زیزۆدا گەشەی کرد، لە یەک نزیک بووینەوە، لە پشووەکاندا بەیەکەوە گەشتمان دەکرد، لە نێو یانە و

دەرەوەشدا بەیەکەوە دادەنیشتین، من بە محەممەد ناوم دەهێنا و ئەویش پێی خۆش بوو، سەرسامیش بوو، ئەو بە راستی یاریزانێکی نایاب بوو، هاوڕێیەکی بەوەفا و دڵسۆز بوو، مرۆڤێکی دەگمەن بوو، لە نێو یاریگەشدا پاسەکانی ئەو لە فەرهەنگی تۆپی پێدا مانای گۆڵ بوو، بە ژیانیشم ئەو پاسەی لە یاد ناکەم، کە لە قۆناخی هەشتی جامی یەکێتیی ئەورووپای ساڵی 1996 پێیدام، کاتێک هەموو بەرگریکارە زەبەلاحەکانی یانەی میلانی بە تۆپێکی جادووگەرانە هەڵخەڵەتاند، من دڵخۆش بووم، ئەویش بۆ من و تیپەکەشمان دڵخۆش بوو، ئەو وەکو منداڵێکی بچووک بوو کاتێک تازە دیارییەکی بۆ دەهێنن، کە ئاواتی بۆ خواستووە".

زیدان چوار وەرز لە یانەی بۆردۆدا یاریی کرد، تێدا 176 یاریی فەرمی ئەنجام دا و 39 گۆڵی تۆمارکرد، ئەو کاتە بۆ زیدان زۆر باش بوو، بە جۆرێک لە ساڵی 1994 خەڵاتی باشترین یاریزانی لاوی بەدەستهێنا، دواتر لە وەرزی 1995-1996 خەڵاتی باشترین یاریزانی فەرەنسای وەرگرت، کە دواوەرزی بوو لەگەڵ بۆردۆدا، هەروەها لە هاوینی 1995 جامی ئینتەر تۆتۆی لەگەڵ یانەکەیدا بەدەستهێنا، هەر لە وەرزی 1995-1996 گەیشتنە یاریی کۆتایی جامی یەکێتیی ئەورووپا

دوای ئەوەی لە میلانی زەبەلاحیان بردەوە، بەڵام دواتر لە یاریی کۆتاییدا بە زەبەلاحێکی دیکە دۆڕان، کە بایرن میونشنی ئەڵمانی بوو، کاتێک بە هەردوو یاریی چوون و گەڕانەوەی کۆتایی، بە 5-1 گۆڵ دۆڕان.

زیزۆ لەو کاتدا بەرامبەر ئەستێرە ناودارەکانی وەکو لوتەر ماتیۆس، یۆرگن کلینسمان و محەممەد شۆل و هاونیشتیمانییە ناودارەکەی، جان پییێر پاپان یاریی کرد.

زیدان دان بەوەدا دەنێت لە بۆردۆ ناوبانگ و ئەستێرەیی دەستپێکرد، لەوێدا بەهرە و متمانەی گەشەی سەند، بەڵام هەر لەوێشدا قژی هەڵوەری!

هەر لەوێدا راهێنەر رۆلان کۆربس نازناوە هەرە ناودارەکەی پێ بەخشی (زیزو)، کە کورتکراوەیەکی جوانی ناوەکەیەتی و لە زمانی فەرەنسیشدا بە شێوەیەکی نایاب گۆ دەکرێت.

جان ڤارۆد، دۆزەرەوەی بەهرەی زیدان دەڵێت "ئەو یاریزانێکی باڵابەرزە، قاچەکانی لەگەڵ تۆپدا قسە دەکەن، دەتوانێت یاریی بە یاریزانێک، بە دووان، سێ، چوار، پێنج و شەش یاریزانیش بکات و تێیانپەڕێنێت".

رۆلان کۆربس لە لای خۆیەوە باسی ئەو شەوە پڕ هاتوهاوارەی ژووری جلگۆڕینی یانەی بۆردۆ دەکات "لە نێو ئەو ئاژاوەگێڕییە کە شوێنەکەی گرتبووەوە،



بینیم به پاژنەی پێیەکانی یاریی به تۆپ دەکرد، پێشتر یاریزانی نایاب و ژیری زۆرم بینیبوو، بەڵام وەکو ئەوم نەبینیبوو، دەمتوانی ئەو شەوە به تەواوی به سەیرکردن و چێژوەرگرتن به دیار ئەو جوولانەوانە بەسەربەرم، کە ئەنجامی دەدا ، بەبێ ئەوەی هەست به بێزاری بکەم یان بێتاقەت بم".

له ئێوارەی چوارشەممە 17ی ئابی ساڵی 1994، له ژێر ئاسمانی شاری بۆردۆ و ئەستێرە درەوشاوەکانیدا، زیدان لەسەر کورسی یەدەگی پێکهاتە سەرنجڕاکێشەکەی ڕاهێنەر ئیمێ جاکێ دانیشتبوو، هیوای دەخواست، یان باشتر بڵێین تۆپ هیوای بۆ ئەو دەخواست. لەو کاتەدا فەڕەنسا له خاکی خۆیدا و له گێمی یەکەمدا به دوو گۆڵ بەرامبەر کۆماری چیک له دواوەبوو، له یاریگەی بارکلیسکیۆر، کە دواتر له 2001دا ناوەکەی بۆ چابان دیلماس گۆڕا، وەکو ڕێزگرتن و وەفایەک بۆ سەرۆکی شارەوانیی بۆردۆ، کە 48 ساڵ خزمەتی شارەکەی کرد. جاکێی ڕاهێنەر دانی به شکست دانەنا و تیرە نوێیەکەی خستە نێو یاریگەوە، زیدان، کە یەکەم دەرکەوتنی نێودەوڵەتی بوو بۆ ئەو، کە پێم وایە باشترین سەرەتای نێودەوڵەتیی بووبێت بۆ ئەستێرەیەکی تۆپی پێ، زیزو هەموو شتێکی ئاوەژوور کردەوە و بیر و خەیاڵی دۆسانی

راهێنەری چیکیشـی پەرشـوبڵاو کرد، دوو گۆڵی لە ماوەی دوو خولەکدا تۆمارکرد، 85 و 87، گۆڵێک بە شـووتێکی بەهێز لـە دەرەوەی ناوچـەی سـزا و گۆڵێکیش بـە لێدانـی سـەر، ئەوکاتـە کەڵەشـێرەکان زێرەکانـە ئەوەیان بینی، کە ئەو کەڵەشـێرە نوێیـە دەنووک زێڕینـە، لـەوان ناچێت و هەرگیزیش وەکو ئـەوان نابێت.

# هەڵەکەی فێرگسۆن

دوای کۆتاییهاتنی گرێبەستی چوار ساڵەی نێوان یانەی بۆردۆ و زیدان، زیزۆ گوێی لە بانگەوازی ئەستێرە درەوشاوەکەی بوو لە ئاسمانی فەڕەنسادا "ئێستا کاتی رۆیشتنە".

ئەو ببووە جێی چاوتێبڕینی ئەوروپاییەکان، لیستێک یانە چاودێرییان دەکرد، تیپێک پەلەی کرد، یەکێکی دیکە پێیاندا هەڵدەگوت، تیپی سێیەمیش نقوومی هەڵەی لوتبەرزی بوون، کە تیپەکەی راهێنەری گەورە سێر ئەلێکس فێرگسۆن بوو، کە ئەوکاتە دەستیان بەسەر سەکۆی نازناوەکاندا گرتبوو، سنووری رکابەرەکانیان بەزاندبوو.

هاونیشتیمانییەکەی زیدان لە مانچێستەر یونایتد، یاریزانە سەرکێشەکە، ئێریک کانتۆنای ئەفسانەی شەیتانە سوورەکان، ئاشکرای دەکات خۆی لە بارەی بەهرە و

تواناکانی زیدانەوە قسەی لەگەڵ فێرگسۆن کردووە و بە پێویستی زانیوە ئەم یاریزانە پەیوەندی بە مانچێستەرەوە بکات، چونکە لە هێڵی ناوەڕاستدا داهێنان دەکات، فرمان دەردەکات و هەموو شتێک یەکلادەکاتەوە. کە ئەمە لە ساڵی 1993دا بوو، بەڵام فێرگسۆن ئەم دیارییە رەتدەکاتەوە و نکۆڵی لە بەهرەمەندیی زیدان دەکات، خۆبەزلزانین و لوتبەرزی باڵ بەسەر مێشکی فێرگسۆندا دەکێشێت.

کانتۆنا لە بارەی ئەوەی ڕوویدا، دەڵێت "پێم وایە هەڵەیەکی زۆر گەورە بوو"

فێرگسۆن لە بەرامبەر ئەو هەڵەیەی، کە بەسەریدا تێپەڕی، لە خۆی خۆش نەبوو، بەڵام ئەوەی کەمێک لە پەشیمانی و حەسرەتەکەی کەمکردەوە، چەند یانەیەکی دیکەی ئینگلتەراش هەمان هەڵەیان کرد، وەکو ئەوەی لە یەک کاتدا مێشکی ئینگلیزەکان بەرامبەر بەهرە و تواناکانی زیدان دووچاری نەزانی و نەفامی بووبێت. ئەگەر فێرگسۆن زیدانی رەتکردبێتەوە، بەڵام رای هارفۆرد راهێنەری بلاکبێرن رۆڤێرزی پاڵەوانی پریمەرلیگی ساڵی 1996، بڕوای بە زیدان و جادووگەرییەکەی هەبوو، دەیەویست بیباتە تیپەکەیەوە، دوای ئەوەی کریستۆف دوگاریی هاوڕێ و هاونیشتیمانیی زیدانی بردە تیپەکەیەوە

و دەیەویست بەیەکەوە یاریی بکەن، بەڵام خاوەنی یانەکە جاک واڵکەر پێی وابوو ئەو پارەیە بەفیڕۆ دەدات ئەگەر بە زیدانی بدات، کە دواتر زۆر پەشیمان بووەوە، تاکو ئەوکاتەی لە ساڵی 2000دا کۆچی دوایی کرد.

واڵکەر ئەوکاتە بە لەخۆباییبوون و لووتبەرزییەوە گوتی: بۆچی گرێبەست لەگەڵ زیداندا بکەین، ئەی ئەوە نییە تیم شیروودمان هەیە"، بەڵام چەند ساڵێک دواتر هەر خۆی دەیپرسی "بەرامبەر زیدان، شیروود کێیە، ئەو هیچ نییە".

دوای 11 ساڵ یان زیاتر، یەکێک لە نووسەرانی کۆڕبەندی هاندەرانی یانەی بلاکبێرن بە ناوی وۆڵکەر پرسیار دەکات "ئەو جیاوازییە چی بوو زیدان دروستی دەکرد؟ بێگومان ئەو کاریگەرییەکی مێژوویی جێدەهێشت. پێش ئەوەی یەکێک لە یانە زەبەلاحەکانی ئەوروپا بیباتە ریزەکانییەوە، کە هیچ دەربازبوونێکی تێدانەبوو.

هاندەرێکی بلاکبێرن بە ناوی لوکا دەڵێت: "ئەمە بەشێکە لە مێژووی بلاکبێرن، رۆناڵدینهۆشمان لە دەست دا، چونکە رەگەزنامەی ئەوروپایی نەبوو، رەنگە پێویست بکات زیدان لە وازهێنانی لە یاریکردنی یەکجارەکی بگەڕێنینەوە و تەنیا یەک وەرز بۆ ئێمەش یاریی بکات".

هەروەها باری سێکلمان، بەڕێوەبەری کاری یاریزانان،



چیرۆکی پەشیمانییەکی هاوشێوە دەگێڕێتەوە، کە دووچاری یانەی نیوکاسڵ یونایتدیش بوو، کە ئەو کات لە ژێر سەرکردایەتی راهێنەر کیڤن کیگاندا بوو، یاریزانی ناوداری وەکو ئالان شیرەر، ئالبێرت فیلیپ. لێس فێردیناند و دیڤید جینۆلا یارییان تێدا دەکرد.

مانای گۆڵ بوو لە وردەکاریی قسەکانیدا، کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ماڵپەڕی سپۆرتی بریتانی ئەنجامداوە، دەڵێت: "چەند دەستەوارەیەکم لەدەست چوو، بەڵام دیارترینیان دەستەوارەی گواستنەوەی زیدان بوو بۆ نیوکاسڵ، لە سەرەتاکانی 1996 دەمتوانی زیدان بە 2 ملیۆن و 200 هەزار پاوەند بگوازمەوە نیوکاسڵ ، ئەوان ئەویان بینی، پاشان گوتیان، ئەوە بە کەڵکی ئەوە نایەت لە خولی ئینگلیزیدا بۆ ئێمە یاریی بکات، بەڕاستی ئەوان هەڵە بوون".

ماسیی زیدان لە تۆڕی یانەکانی ئینگلتەرا رزگاری بوو، ئەو گەمژەییە هیچی بەدوادا نەدەهات، تەنیا پەشیمانی نەبێت، شەیتانەکانی مانچێستەر و گەڕۆکەکانی بلاکبێرن و باڵندە دەنووک درێژ و زماندرێژەکانی قەڵای نیوکاسڵ، هەموویان زیدانیان لەدەست چوو، پەشیمان بوونەوە، هەرچەندە ئەو ساڵانە دەیان هەڵەی وایان تێپەڕاند، بەڵام ئەو چرکەساتانە هەرگیز لە یادەوەرییاندا ناسڕێتەوە، کە

خەفەتبارترینیان بۆ ئەنجامنەدانی گرێبەستی زیدان، جاک والکەری سەرۆکە شارەزاکەی یانەی بلاکبێرن بوو، کە یاخیبوون مێشکی داگیرکرد و بەرامبەر بڕیاری دابینکردنی پارە بۆ گرێبەستەکە وەستایەوە، ئەمەش وەکو لێدانێکی کوشندە بوو لە بڕبڕەی پشتی یانەی بلاکبێرن، کە دوای ئەمە، سەرکەوتنەکانی تیپەکە درێژەی نەکێشا و وشک بوو.

والکەریش دواتر لە پێناو پارەدا دەستبەرداری زۆرێک لە یاریزانەکانی تیپەکەی بوو، کە دیارترینیان گۆلکاری بەناوبانگ ئالان شیرەر بوو، کە بە 15 ملیۆن پاوەند چووە ریزەکانی یانەی نیوکاسلەوە.

فێرگسۆنیش لە لای خۆیەوە هەر سەرسامی زیدان بوو، بە رادەی پێداهەلگوتنی، بەرامبەریشی دۆڕا، کە دواتر هەولی دا گرێبەستی لەگەلدا بکات، بەلام شکستی هێنا، لەوە تێگەیشت پشتگوێخستنی ئامۆژگارییەکەی کانتۆنا گوناهێکە هەرگیز لێخۆشبوونی بۆ نییە و ناشاردرێتەوە، ئەو ئەو شەیتانە سوورە بوو، کە هەرگیز لەو هەلەیەی خۆی نابوورێت و نقوومی پەشیمانییەکی گەورە بوو، کە زمانحالی شیعری ئەو شاعیرە بوو، کە دەلێت: "لێگەڕێ با پەشیمانبوونەوە پەشیمانییەکەت کۆتایی پێ نەهێنێت"، هەرکاتێکیش رۆلی ئەو بهاتایەپێش بۆ دەستنیشانکردنی

پێکهاتەی مێژوویی و تیپی خەونەکان، هەموو کاتێک بێ دوودڵی ناوی زیدانی لە تەک ناوی مارادۆنا و پێلێ دادەنا.

یاریزانی پێشوو "تیم شیروود"، کە هۆکاری ئەوەبوو جاک واڵکەری سەرۆکی یانەی بلاکبێرن گرێبەست لەگەڵ زیداندا نەکات، دەڵێت: هەلێکی گەورە و مێژووییمان لە دەست دا، هیچ کاتێک لە کاروانی ئەو یانەیەدا دووبارە نابێتەوە، چونکە جاک واڵکەر پسپۆڕ بوو، دوو چاوی هەبوو، کە بەرامبەر یاریزانان بێ هیوای نەدەکرد، بەڵام هەڵەی کرد، هەرچەندە رێزی دەگرم کە منی بە ئەفسانەیەکی وەکو زیدان بەراورد کرد، کە ئەوکاتە هەرچەندە ناوبانگیشی نەبوو، بەڵام عەیب و نەنگی ئێمە لەوکاتەدا ئەوەبوو، کە پاڵەوانی پریمەرلیگ بووین، بەڵام کارمان بۆ ئەوە نەکرد و ئەوەمان بونیاد نەنا، کە پارێزگاری لە تیپەکە بکەین، لە بیرمە کاتێک دوگاری و زیدان لەگەڵ رای هارفۆرد قسەیان دەکرد، ئێمە دەمانتوانی دەستکەوتەکانمان بپارێزین و خۆمان و تیپەکەشمان باشتر بکەین، بەڵام جاک واڵکەر پێی وابوو ئێمە پێویستمان بە کەس نییە و دەتوانین دووبارە ببینەوە پاڵەوانی خولی ئینگلتەرا، بەڵام ئەو هەڵە بوو، بەڵکو ئەمە گەورەترین هەڵەی ژیانی بوو".

# بەشی چوارەم

## شەیتانێك لە بەهەشتی تۆپی پێدا

### رێوییەکە، جادووگەرەکەی هێنا

سێ ملیۆن و دووسەد هەزار پاوەند، ئەو نرخە بوو کە بەرپرسانی یانەی یوڤێنتوسی ئیتالی بە زیدانیان دا بۆ ئەوەی دریسە رەش و سپییەکەی یانەکە بپۆشێت، رێوییەکەی تۆرینۆ، شێرەکەی مێرکاتۆ، لۆچیانۆ موجی، پێش هەموویان بە زیدان گەیشت. ئەوکاتە یوڤێنتوس پاڵەوانی ئەوروپا بوو لەگەڵ ئەو راهێنەرەی کە هەمیشە جگەرەی هاڤانای بەسەر لێوەوە بوو، مارچێلۆ لیپی، کە لە یاریی کۆتاییدا لە نێو خاکی گورگەکانی رۆمادا لە ئایاکسیان بردەوە و جامە خاوەن دوو گوێچکەکەیان لە

باوەش گرت، جامی خولی یانە پاڵەوانەکانی ئەوروپا.

زیزۆ پەیوەندیی بە ریزەکانی ئەو تیپەوە کرد، کە ئەلیساندرۆ دیل پییرۆ، ڤیالی، دیدیێ دیشامپی هاونیشتیمانی، کۆنتی، راڤانیلی و پیرۆتزیی گۆلپاریز لەویدا یارییان دەکرد، زیدان ئەو کاتە بە شێوەیەکی زۆر بەرچاو لە ئەوروپادا دەرکەوت و جێگەی بایەخی چاودێران بوو، بە تایبەتی دوای ئەوەی لە یانەی بۆردۆوە زۆربەی خاڵە لاوازەکانی خۆی چارەسەرکرد بە هۆی راهێنەری تەکنیکی پییر لابات، کە زۆر لێیەوە نزیک بوو، بە تایبەتی لێدانەکانی سەر، کە پێشتر لە منداڵیدا هیچی لێ نەدەزانی، بەڵام دواتر بوو بە تایبەتمەندی لێدانەکانی سەر و بەرزیی باڵاشی یارمەتی دا.

هەروەها بەو گۆڵەی لە تۆڕی ریال بێتیس لە جامی یەکێتیی ئەوروپادا تۆماری کرد، ناوبانگی زیاتر دەکرد، گۆڵێکی دەگمەن و داهێنەرانە، کە لە دووری 45 یاردە و بە قاچە چەپە بۆمبرێژکراوەکەی تۆماری کرد، هەر لە دوای ئەمەش خەڵاتی باشترین یاریزانی فەرەنسای بەدەستهێنا.

دوای ئەوەشی کە ئینگلیزەکان لە گەمژەیی و نەزانینی خۆیان زێدەڕۆییان بەرامبەر زیزۆ کرد، مارچێلۆ لیپی گوێی لە ئامۆژگارییەی میشێل پلاتینی گرت و وردبینیی

خۆی کرد و لۆچیانۆ موجی راسپارد، زیزۆ بهێنێتە یوڤی، ڕێوییەکەش کارەکەی ئەنجام دا و جادووگەرە فەرەنسییەکەی هێنایە تۆرینۆ.
لەگەڵ ئەوەی زیدان لە زێدی خۆی دابڕا و ماوەی نزیکەی 10 ساڵ لە خانەوادەکەی دوورکەوتەوە بەهۆی یاریکردنی لە هەردوو یانەی کان و بۆردۆدا، لە مانگی ئایاری 1993 لەگەڵ ڤیرۆنیکا فێرناندیز هاوسەرگیریی کرد، بەڵام لە سەرەتاشدا دووچاری نامۆبوونێکی کلتوری و رۆشنبیری بوو، کاتێک روویکردە تۆرینۆ، باکووری رۆژئاوای ئیتاڵیا، لە کەناری رووباری (پوو)، کە لەوێدا هونەری رۆکۆکۆ برەوی هەیە و چێژبەخشە، لەوێدا سیستم جیاواز بوو، تەکتیک و شێوازی یاریکردن و جوولانەوەکان جیاوازبوو، لەگەڵ ئەوەشدا قژی زیاتر و خێراتر هەڵدەوەری، کە نزیکترین هۆکاری بۆماوەیی باوک و باپیرانی بوو، جگە لەوەش پاڵەپەستۆیەکی زۆری کەوتەسەر، دوای ئەوەی بە مێشێل پلاتینی بەراورد کرا، کە لێی دەرباز نەدەبوو، بێگومان ئەو پاڵەپەستۆیانەش لە سەرەتادا یارمەتییان نەدا، لەگەڵ سەرەتای زەحمەتی زیزۆشدا، پلاتینی لە چاوپێکەوتنێکدا دەرکەوت و گوتی: "ئەو سەرەتا سستەی زیدان، دەتەقێتەوە، ئەگەر ئەرکی یاریزانی ژمارە 10 وەربگرێت"



مەبەستی ئەوەبوو زیدان وەکو یاریساز (مایسترۆ) لە ناوەڕاستدا یاریی بکات، کە وا دەکات واژوو لەسەر تۆپەکانی بکات پێش ئەوەی بۆ هێرشبەرەکانی بنێرێت. هاوکات پلاتینی رەخنەی لەو رۆڵ و فرمانە تەکتیکییە سنووردارانەی لیپی گرت، کە بەهۆیەوە بەبێ مەبەست زیدانی پێ خنکاندبوو، لە بەرامبەر دا لیپی وەڵامی بۆ ئەمە هەبوو، زیدانی لە کۆت و بەند و ئەرکە تەکتیکییەکان ئازاد کرد، ئەمەش وایکرد زیزۆی 20 ساڵان بە قژە رووتاوە تایبەتەکەی، کە لە پشتی سەرییەوە بوو، لە نێو یاریگەکانی ئیتاڵیا و ئەورووپادا جادوو بڵاوبکاتەوە.

زۆر بە خێراییش قاچەکانی لە نێو هزری چاودێراندا چەقاند، خۆی دروستکرد، زیاتریش پێگەیشت لە تەک دیشامپی هاونیشتیمانی و ئانجیلۆ دی لیڤیۆ و جۆگۆڤیچدا. زیزۆ لە وەرزی یەکەمیدا لەگەڵ یوڤی 7 گۆڵی لە 41 یاریدا تۆمارکرد، رۆڵێکی باڵاشی هەبوو یانەکەی سێ نازناو بباتەوە، خولی ئیتاڵیا، کە چوار ساڵ بوو لە لایەن میلانی کاپێلۆوە قۆرخ کرابوو، جامی سوپەری ئەورووپا، کە لە پاریس سانجێرمانیان بردەوە. هەروەها جامی جیهانیی یانەکان، کە لە فایناڵدا لە ریڤەرپلەیتیان بردەوە، ئەو تیپەی یاریزانی بەناوبانگ فرانچیسکۆلی، نموونەی بەرزی زیدان، سەرکردایەتی دەکرد، بەڵام خەونە گەورەکەیان



لەبارچوو، ئەویش خولی یانە پاڵەوانەکانی ئەوروپا، کە بەرامبەر دۆرتمۆندی ئەڵمانی لە نێو یاریگەی ئۆڵمپی لە بەرلین و بەرامبەر 60 هەزار هاندەر، بە ئەنجامی 3-1 گۆڵ دۆڕان، لەو یارییەی کە پۆل لامبێرتی سکۆتلەندی و یاریزانی ئەوکاتی دۆرتمۆند، توانی مەترسییەکانی زیزۆ رابگرێت و لە دوای یارییەکەش بە بەزێنەری زیدان ناوی دەرکرد.

لامبێرت دەڵێت: "کاتێک بەرامبەر زیدان یاریی دەکەیت، پێویستە وردبینیت 100% بێت، ئەگینا زەرەرێکی گەورەت پێدەگەیەنێت، پێویست لەسەرت لە هەستێکی باشدابیت بۆ ئەوەی بەرەنگاری ببیتەوە، چونکە ئەو باشترینی جیهانە".

زیدان لە وەرزی یەکەمیدا لەگەڵ یوڤی، ئیلهامبەخشێکی گەورە بوو، چێژێکی زۆری بە خولی ئیتاڵیا بەخشی، نیگای چاوەکانی لە ئەوروپا بۆ خۆی برد، کە ئەو کات خولی ئیتاڵیا بەهێزترین خول بوو، بەهەشتی تۆپی پێ بوو، هەروەکو دییگۆ مارادۆنا وەسفی دەکرد.

زیزۆ لە وەرزی یەکەمیدا لەگەڵ یوڤێنتوسدا خەڵاتی باشترین یاریزانی بیانی بەدەستهێنا، لە ئاهەنگی خەڵاتەکانی ئۆسکاری ساڵانەی تۆپی پێی ئیتاڵیا، جگە لەم خەڵاتە، شایستەی خەڵاتی باشترین یاریزانی ساڵیش

بوو، بەڵام خەڵاتەکە درایە رۆبێرتۆ مانچینی.

لە وەرزی دووەمدا 1997-1998، دووبارە نازناوی خولی ئیتاڵیای بردەوە و جامی سوپەری ئیتاڵیاشی بەدەستهێنا بە تۆمارکردنی سێ گۆڵ لە تۆڕی یانەی فیچینزا. هەروەها تیپەکە گەیشتە یاریی کۆتایی خولی یانە پاڵەوانەکانی ئەوروپا، بەڵام جارێکی دیکە دۆڕا و ئەمجارەیان بەرامبەر ریال مەدرید، کە مێرنگی نازناوی چامپیۆنزلیگی بۆ جاری حەوتەم بردەوە بە سەرکردایەتی گورگە ئەڵمانییەکە، یۆب هاینکس.

زیزۆ لەگەڵ فیلیپۆ ئینزاگی و دیل پییێرۆ سێکوچکەیەکی ترسناکیان پێکهێنابوو، کە هۆکاری سەرەکیی بوون تیپەکەیان نازناوی 25ـەمینی خولی ئیتاڵیا بباتەوە، هەروەها بوونە هۆکاری دوورخستنەوەی کاپێلۆش لە میلان، کە دوای وەرزێکی سەرکەوتوو لەگەڵ ریال مەدرید و بردنەوەی نازناوی 27ـەمینی لالیگا لەگەڵ یانەکە، گەڕابووەوە میلان، بەڵام بە دەستبەتاڵی لەسەر کار لادرا.

یوڤێنتوس لە دووەم وەرزی زیداندا لەوێ، تیپێکی هێرشبەرانە بوو بە شایەتی ژمارە و داتاکان، بە پێچەوانەوەی وەرزی یەکەم، تەنانەت لە هەردوو وەرزدا لەسەریەک لە چامپیۆنزلیگدا و لە قۆناخی کۆمەڵەکاندا،

کەوتنە بەرامبەر مانچێستەر یونایتد، لە هەر چوار یاریی چوون و گەڕانەوەی هەردوو وەرزدا، زیدان جێپەنجەی خۆی لە یارییەکاندا جێهێشت و هەستی پەشیمانیی بۆ فێرگسۆن دوو هێندە کرد، کە ئامۆژگارییەکەی کانتۆنای لە گوێ نەگرت، کاتێک پێی گوتبوو "ئەو جاوودگەرە بهێنە تیپەکەتەوە".

زیدان لە وەرزی 1997-1998دا 84 یاری بە درێسی یوڤی ئەنجام دا و 11 گۆڵی تۆمارکرد و دەیان تۆپی یەکلاکەرەوەشی دایە فیلیپۆ ئینزاگی و دیل پییێرۆ، ئەوانیش بەیەکەوە 53 گۆڵیان تۆمارکرد، هەر لەو وەرزدا زیدان بە باشترین یاریزانی هێڵی ناوەڕاست لە ئەورووپا دەستنیشانکرا و هەروەها خەڵاتی بالۆن دۆری وەکو باشترین یاریزان بەدەستهێنا وەکو چوارەم فەرەنسی، کە ئەو خەڵاتە بباتەوە، لە دوای ریمۆند کۆپا، میشێل پلاتینی و جان پییێر پاپان.

زیزۆ 244 دەنگی لە پرۆسەی دەنگدانی بالۆن دۆردا بەدەست هێنا و بە جیاوازییەکی یەکجار زۆر، کە 175 دەنگ بوو، لە پێش داڤۆر سوکێری کرواتی و رۆناڵدۆی بەرازیلییەوە بوو، کە هەر لەو وەرزدا لە پێکهاتەی نموونەیی ساڵدا لەلایەن گۆڤاری ESM ـەوە دەستنیشانکرا، ئەو گۆڤارەی کە بە هاوبەشییەکی

گەورەی نێوان رۆژنامە و بڵاوکراوە ناودارەکانی جیهان، لە ئەوروپا، چین، کۆریای باشوور، رووسیا و باشووری ئەفریقاوە راپرسییەکەی ئەنجام دەدا.

مارچێلۆ لیپی بەم جۆرە وەسفی زیدان دەکات "ئەو سەرتوێژی (کەرە) تۆپی پێیە، ئەو هەموو شتێکی هەیە لەم یارییەدا، هەرگیز پێویستی بەوە نییە هیچ رێنمایی و ئامۆژگارییەکی بکەیت، هەموو شتێک خۆی دەیکات، دەزانێت و پێشبینیی دەکات، بە بڕوای من زیدان لە دوای مارادۆنا باشترین یاریزانە".

هەروەها دەگێڕێتەوە: "شەوێک لە کاتژمێر 11دا لە چێشتخانەیەک هاتمە دەرەوە، بینیم زیدان لەگەڵ چەند کەسێکدا یاریی دەکات، لێم پرسی لەو کاتە درەنگەی شەودا چی دەکەیت، پێی گوتم حەزدەکەم لەگەڵ هاوڕێیەکانمدا یاریی بکەم، پێم گوت ئەوە مافی خۆتە، بەڵام سووربە لەسەر ئەوەی زوو بخەویت".

لە بارەی سەرەتای هاتنی زیزۆ بۆ تۆرینۆ، لیپی دەڵێت: "ئەوکاتەی هات پاڵەپەستۆیەکی زۆری لەسەر بوو، چونکە هەموو لایەک دەیانویست بە پلاتینی بەراوردی بکەن، منیش پێمگوت ئارامبە و چۆن حەزدەکەیت وا یاریی بکە، هەر ئەمەشی کرد".

لە وەرزی سێیەمی زیداندا لەگەڵ یوڤیدا، 1998-1999،

ئەنجامەکانی لافێکا سینیۆرا داڕووخانێکی بەرچاوی بەخۆیەوەبینی، کە لەوەتەی 1990ـەوە یەکەمجار بوو تیپەکە بەم شێوەیە خراپ بێت. یاریی سوپەری ئیتاڵیای بە گۆڵێک بە لازیۆ دۆڕاند، کە کۆنسێساوی پۆرتوگالی گۆڵەکەی تۆمار کرد، ئەلیساندرۆ دیل پییرۆ دووچاری پچڕانی بەستەرەکانی ئەژنۆی بوو، دواتر مارچێلۆ لیپی لەسەر کار لادرا و لە شوێنی ئەودا کارلۆ ئانچیلۆتی کرایە ڕاهێنەر، کە لە یانەی پارماوە هاتبوو.

ئەوکاتەشی ئانچیلۆتی دەسەڵاتی یوڤی وەرگرت، توانی وەرزەکەی یوڤی ڕزگار بکات و ڕووی تیپەکە سپی بکاتەوە بە گەیشتنی بە پێشکۆتایی چامپیۆنزلیگ، بەڵام لەوێدا لە یاریی چوون لە یاریگەی خۆیدا بە 3-2 گۆڵ دۆڕا، هەرچەندە سەرەتا یوڤی بە گۆڵێکی ئینزاگی پێشکەوت.

ئانچیلۆتی لە خولی ئیتاڵیاش تیپەکەی لە پلەی حەوتەمدا جێگیر کرد لە دوای ڕۆما، لە بەرامبەردا ئەی سی میلان بووە پاڵەوان بە سەرکردایەتی ڕاهێنەر ئەلبێرتۆ زاکیرۆنی.

زیزۆ لە وەرزی سێیەمیدا لەگەڵ یوڤێنتوس 40 یاریی ئەنجام دا، تەنیا 2 گۆڵیشی تۆمارکرد، ئەمەش کارێکی بەڵگەنەویست بوو لە ساڵێکدا، کە وەکو دێوەزمەیەک بوو بۆ هاندەرانی تیپەکە.



لە وەرزی چوارەمیدا 1999-2000 زیدان بەشداریی 41 یاریی کرد و 5 گۆڵیشی تۆمار کرد، سەرەڕای ئاستبەرزیی زیدانیش، بەڵام وەرزەکە بۆ یوڤی تاریک و کارەساتبار بوو، زۆر لە وەرزی پێشتر بە ئازارتر بوو، چونکە سیناریۆی وەرزەکە زۆر بە ئازارتر هات، تیپەکە هەر زوو لە جامی ئیتاڵیا کرایە دەرەوە، پێش ئەوە جامی ئینتەرتۆتۆی هاوینەی بردەوە، کە وەکو پاڵاوتن بوو بۆ گەیشتن بە جامی یەکێتیی ئەوروپا، بەڵام لەوێشدا لە قۆناخی 16دا زیاتر تێنەپەڕی و بە چوار گۆڵ بە یانەی سێلتاڤیگۆی ئیسپانی دۆڕا.

بەڵام ئایە لە خولی ئیتاڵیا چی روویدا؟ ئەمە چیرۆکێکی تراژیدییە، هەروەکو عاشقانی تیپەکە و بەرپرسانی یانەکە و هەموو ئەوانەی لە لاڕێی تیپەکەدا بوون، وایدەبینن.

تیپەکە گەرێک پێش کۆتاییهاتنی خولەکە، بە 71 خاڵ پێشەنگی ریزبەندی بوو، لازیۆ کە لە پلەی دووەم بوو، 69 خاڵی هەبوو، لە دواگەڕدا خانمە پیرەکە لە دەرەوەی یاریگەی خۆی لەگەڵ بیروجیا یاریی هەبوو، لازیۆش لەسەر یاریگەی خۆیدا بەرامبەر رێجینا یاریی دەکرد. هەموو پێشبینییەکان لە بەرژەوەندیی یوڤێنتوس بوون، بەڵام ئاسمان بارانی باراند، بارانێک کە لە چاوی خەڵکی تۆرینۆ، زیدەڕۆیی بوو، یاریگەی بیروجیا نقوومی

ئاو بوو، بە کەڵکی یاریی نەدەهات، بەڵام ناوبژیوانە بەناوبانگەکە، کۆلینای سەر کەچەڵ، نەچووە ژێر باری پاڵەپەستۆی بەرپرسانی یوڤی و فیکەی دەستپێکی یارییەکەی لێدا، یوڤی بە گۆڵێک یارییەکەی دۆڕاند، کە ئەلیساندرۆ کالۆری تۆماریکرد، لەگەڵیدا نازناوەکەی لە دەست دا، چونکە لەولا هەڵۆکانی لازیۆ بە سێ گۆڵ لە ڕێجینایان بردەوە و نازناوەکەیان بەدەستهێنا.
لۆچیانۆ موجی، ڕێوییەکەی ئیتاڵیا و بەڕێوەبەری تیپی یوڤێنتوس لە بارەی ئەو ڕۆژەوە قسە دەکات و بە ئازاری یادەوەرییەکانەوە دەڵێت: "پێویستم بە کەسێکە بۆم ڕوونبکاتەوە چۆن کالچیۆمان دۆڕاند، ئێمە لە مەلەوانگەدا یاریمان کرد، دەبوو لە یاریگەدا بێینە دەرەوە، بەڵام لە ژێر بەزەیی ئەوانەی بڕیاریان لە چارەنووسی ئێمە دەدا، لە یاریگەدا ماینەوە، بەڵام ئەوان ون بوون، دەبێت و پێدەچێت کۆلینا لەگەڵ کەسێک بە تەلەفۆن قسەی کردبێت، بەڵام هەرگیز نەمانتوانی ناسنامەی ئەو کەسە بزانین، ناکرێت وەستانی یاری زیاتر لە 45 خولەک بخایەنێت، بەڵام کۆلینا دوو هێندەی ئەو کاتە یارییەکەی وەستاند.
کاپتنی ئەوکاتی تیپەکە، کۆنتی، لەگەڵ موجی هاوڕایە و دەڵێت: "هەر زوو زانیمان یارییەکە دواناخرێت، ئەمەش

لە ترسی هاندەرانی لازیۆ لە رۆمای پایتەختدا، لە راستیدا هەمووان دژی ئێمە بوون".

بەڵام لۆچیانۆ گوچی، سەرۆکی یانەی بیروجیا، بە راشکاوی دەڵێت: "پێش دەستپێکردنی یارییەکە هەڕەشەم لە یاریزانەکانم کرد، ئەگەر لە یوڤێنتوس نەبەنەوە، ئەوا لە رۆما رادەکەم و ئێوەش دەنێرمە چین بۆ کەمپێک بۆ ماوەی سێ مانگ، هەروەها بە سەرپەرشتیاری یارییەکەشم گوت، ئەگەر یارییەکە بوەستێنن ئەوا ئێمە دووبارەی ناکەینەوە".

کارەکە هەر بەوەندە نەوەستا، بەڵکو زنجیرەی سووتاندنی دەماری ئاشقانی یوڤێنتوس بەردەوام بوو، کاپتنی یانەی بیروجیا ریناتۆ ئۆلیف دەڵێت: "لە راستیدا گۆڕەپانی یاریگەکە شیاوی ئەوە نەبوو یاریی لەسەر بکرێت، بیرمە کۆنتیی کاپتنی یوڤێنتوس ئەوکات گوتی، تۆپەکە لە زەوی جیانابێتەوە، لە شوێنی خۆی ناجولێت، ئەو راستی دەکرد، لە وەرزی پێش ئەو کاتەشدا لە رێگەی یارییەکەمان بەرامبەر میلان، ئێمە بووینە هۆکاری دەستنیشانکردنی پاڵەوانی کاڵچیۆ، کە یارییەکەمان بە دوو گۆڵ دۆڕاند، بەڵام لە لایەن یانەکەمانەوە سزادراین، چونکە وامان کرد لازیۆ نەبێتە پاڵەوان، جگە لەوە هیچ دیاری و پاداشتێکمان وەرنەگرت، هەرچەندە ئێمە تیپەکەی خۆمان لە دابەزین

رزگار کرد، سەرۆکی یانەکەمان زۆر پاڵەپەستۆی دەخستە سەرمان و دەیگوت یاریی بیروجیا و یوڤێنتوس ژیانی ئێمەی بۆ باشتر گۆڕی، یان خراپتر. ئێمەش دەمانویست هەمان کار دووبارە نەکەینەوە، یان باشتر بڵێم ئەوان نەیاندەویست لازیۆ نازناوەکە لە دەست بدات.
ئەو لێدوانانە بەبێ هیچ کاردانەوە و لێپرسینەوەیەک تێپەڕین، بەڵام وەکو بەڵگەیەک بەدەست هاندەرانی یوڤێنتوسەوە مایەوە، وەکو گومانێک لە بوونی گەندەڵی و یاریکردن بە ئەنجامی یارییەکان لە ڕووداوەکانی شەوی بارانەکەدا.
لە ڕاستیشدا کارلۆ ئانچیلۆتی بەرپرسیاری بەشێکی گەورەی ئەنجامەکانی تیپەکەی بوو، چونکە لە دوا هەشت یاریدا لە خولی ئیتاڵیا، چوار یاریی دۆڕاند. کە هەر ئەو بوو تیپەکەی تێوەگلاند و خزاندییە نێو تونێلی تاریکی لێکدانەوەی ئەنجامەکان و پاڵەپەستۆی دوا یارییەکانی کۆتایی خول، کە بارودۆخی ئاڵۆزیان هەیە.
لەو ساڵدا زیدان لە لایەن گۆڤاری بەناوبانگی وۆرلد سۆکەرەوە لە لیستی باشترین 100 یاریزانی سەدە دیارییکرا، ئەو گۆڤارە دێرینەی کە لە ساڵی 1960ـەوە دامەزراوە، هەروەها زیدان لەلایەن فیدراسیۆنی نێودەوڵەتیی تۆپی پێ (فیفا) بۆ جاری دووەم بە باشترین

یاریزان دەستنیشانکرا، کە 370 دەنگی بەدەست هێنا و بە جیاوازی 41 خاڵ لە پێش لویس فیگۆی پۆرتوگالی و 107 دەنگیش لە پێش ریڤاڵدۆی بەرازیلییەوە بوو.

دوای ئەمە، ئەوە بە خەیاڵ و هزری بەرپرسە دڵڕەش و ڕەشبینەکانی تۆرینۆدا نەهات، کە وەرزی 2000-2001 دواوەرزی زیدان دەبێت لەگەڵ لافێکا سنیۆرادا، لەو وەرزیشدا ئانچیلۆتی لە 39 یاریدا بەشداریی بە زیزۆ کرد و 6 گۆڵی تۆمارکرد، تۆمارێکی وردیش نییە بۆ ئەو ئاسیستانەی بۆ هاوڕێیەکانی کرد لە یارییەکاندا و چەند تۆپی بە واژووی پێلاوەکانی خۆی پێدان لە یارییەکاندا، بەڵام ئەو کلیلە جادووگەرانەییەی، کە دەرگەی هەموو هێڵەکانی بەرگری پێ دەکردەوە، رەنگە بەم زووانە دایبنێت.

هەر لەو وەرزدا کاپێلۆی بلیمەت سێیەم نازناوی مێژوویی سکۆدیتۆی بۆ رۆما بەدەستهێنا، کە یاریی گەڕانەوەی نێوان یۆڤێنتوس و رۆما لە یاریگەی دێلی ئالپیی بوو لە تۆرینۆ (یاریگەی پێشووی یوڤێنتوس، کە ئێستا یاریگەی یانەکە ناوی یوڤێنتوس ئارینایە)، یارییەکەش پێش شەش گەڕ بوو لە کۆتاییهاتنی خولەکە، هەر ئەو یارییەش بوو کە بە وردی رووخساری پاڵەوانی وەرزی دیاریی دەکرد، یوڤێنتوس سەرەتا هەر زوو بە دوو گۆڵ پێشکەوت، کە



دیل پییرۆ و زیدان تۆماریان کرد، تیپەکەی ئانچیلۆتی خۆی راگرت، بەڵام کاپێلۆ لە لایەکی دیکەوە خەریکی هەڵدانەوەی پەڕاوەکان بوو، بە ئامانجی شۆڕشێکی درەنگ دەیجولاندن، هەر ئەوەش روویدا، کە هیوای بۆ دەخواست، لە خولەکی 79دا تۆپێکی مووشەکئاسای ناکاتای ژاپۆنی تۆڕی گۆڵی ڤان دێر ساری هۆڵەندی هەژاند، هێشتا ناوبژیوانیش سەیری کاتژمێرەکەی دەستی نەکردبوو، بۆ ئەوەی فیکەی کۆتایی لێبدات و کۆتایی یارییەکە رابگەیەنێت، وەکو ئەوەی فیکەکەی دەستی پێی بڵێت بە یارمەتیت چەند چرکەیەک بوەستە، مۆنتێلا گۆڵێکی بکوژی بۆ رۆما تۆمارکرد.

رکابەرەکانی یوڤی لە دواگەڕەکاندا تالاوی شکستیان چەشت، بەڵام رۆما ئەوەی پێویست بوو، ئەنجامی دا بۆ ئەوەی خانمە پیرەکە لە نازناوەکە دووربخاتەوە، وەکو دوورخستنەوەی ئەهریمەن لە بەهەشتدا.

خۆشی و شادی هەموو رۆمای گرتەوە، هەموو رێگەکان بەرەو خۆشییەکی گەورە بوون، ئەگەر لازیۆ لە وەرزی پێشوودا نیوەی شاری رۆمای دڵخۆش کردبێت، ئەوا کاپێلۆش نیوەکەی دیکەی دڵخۆشکرد.

کاروانی یوڤێنتوس لە خولی پاڵەوانانی ئەوروپاشدا بە هەمان شێوە خراپ بوو، بێ هیواییەکی گەورەبوو،

تیپەکە بۆ یەکەمجار لە مێژووە شکۆدارەکەیدا، لە دەرگەی دواوەی قۆناخی کۆمەڵەکاندا چووە دەرەوە، زیدانیش لە یارییەکانی قۆناخی کۆمەڵەکاندا دوو کارتی سووری وەرگرت، یەکێکیان بەرامبەر دیپۆرتیڤۆ لاکۆڕۆنیا و ئەوی دیکەش بەرامبەر هامبۆرگ، دوای لێدانە سەرە ناسراوەکەی لە دەموچاوی یوخین کینتز، کە بە هۆیەوە بۆ پێنج یارییش بە راگرتن سزادرا.

یوخین لە بارەی رووداوەکە دەڵێت: "کاروانی وەرزشییم جیاوازتر بوو، راهێنەر ئەو ڕۆژە رایسپاردم چاودێرییەکی ورد و لەزگەئاسای زیدان بکەم.

هەر لەم وەرزدا زیدان خەڵاتی باشترین یاریزانی ئەورووپای پێنەدرا، ئەمەش بە هۆی ئەوەی بوو دوو کارتی سووری وەرگرت، زیدان ئەوکات خۆی پێی وابوو لەبەر ئەم هۆکارە خەڵاتەکەی پێنەدرا "شتێکی روونە دوو کارتە سوورەکە لە خەڵاتەکە بێ بەشیان کردم، ئەمە دەبێتە رابردوو، من ئێستا تەنیا دەمەوێت سەیری داهاتوو بکەم".

دوای ئەم وەرزە خراپە، ئیتر کورسییەکەی ئانچیلۆتی پارێزراو نەبوو، هەڕەشەی لەسەر بوو، ئیتر لە لایەن یانەکە، بەرپرسانی، جەماوەرەکەی و میدیای نزیک لە یانەکەشەوە بژاردەیەکی باش و قبوڵکراو نەبوو، هاوکات



گومان هەبوو لەوەی ئەو بارودۆخەی هاتەپێشەوە، زۆر بە لایەوە جێی بایەخ نەبوو، جگە لە گومانبردن و تۆمەتبارکردنیش.

ئانچیلۆتی دوورخرایەوە، خوات لەگەڵ کارلۆ، کە لە دانپێدانانەکانی دەڵێت: "لە ژیانمدا یاریزانێکی وەکو زیدانم نەبینیبوو، ئەو باشترین یاریزانە مەشقم پێ کردبێت، هەر بە هۆی ئەوەوە بوو لە ئیتاڵیا وازم لە شێوازی بەرگریی کلاسیکی (کاتاناچۆ) هێنا. بەڵکو سەرکێشییەکی هێرشبەرانەم دەستکەوت، کارامەیی و ئەفسانەیی ئەو، منی بەرەو ئەو گۆڕانکارییە برد، چۆن دەتوانم بە پلانێکی بەرگری یاریی بکەم، لە کاتێکدا باشترین یاریزانی هێڵی ناوەڕاستی جیهانم هەبێت".

کاتێکیش لە بارەی زیدانەوە پرسیار لە فیلیپۆ ئینزاگی کرا، بێ دوودڵی و وەستان گوتی: ئەو یاریزانێکی شکۆدارە، شایەنی هەموو پیاهەڵدانێکە. شایەنی هەموو بەرز راگرتنێکە".

لە لای خۆیەوە ڤان دێر ساری گۆڵپارێزی هۆڵەندیش بۆچوونی دەخاتە پاڵ ئەوانەی پێیان وایە ئەو تایبەتمەندییانەی زیدان هەیەتی، هیچ یاریسازێکی دیکە نییەتی، کاتێک دەڵێت: "ئەو یاری بە شێوازێکی جیاواز دەبینێت، گۆشەنیگای جیاوازی هەیە، کە بەهۆیەوە

بارودۆخەکە شرۆڤە دەکات و ئینجا بڕیار دەدات".

هەر ئەو کاتانە جێرارد هۆییێی ڕاهێنەری فەڕەنسی بە شایستەییەوە باسی زیزۆ دەکات و دەڵێت: هەر یەکەمجار لە فەڕەنسا بینیم، زیدان بەهرەمەند بوو، بەڵام یاریکردنی لە ئیتاڵیا بە تەواوی ئەوی گۆڕی، وایکرد ببێتە باشترین".

ئەو ڕاهێنەرە خۆی لە بەراوردکاری نێوان پلاتینی و زیدان دەپارێزێت و دەڵێت: "فەڕەنسا چانسی هەیە، دوو یاریزانی گەورەی هەبوو، بۆیە کارێکی باش نییە بەراوردی نێوانیان بکەین، چونکە شێوازی یاریکردنیان جیاواز بوو، سەردەمیان جیاواز بوو، بۆیە ناتوانین بڵێین کامەیان باشتر بوو. ئەمە گونجاو نییە و لە بەرژەوەندیی فەڕەنساشدا نییە، بۆیە تەنیا لە یاریکردنیان چێژ وەرگرن".

هەروەها ئەفسانەی تۆپی پێی ئینگلتەرا گاری لینیکەر لە بارەی زیدانەوە بۆچوونی خۆی هەیە "زیدان شکۆدارترین و بریقەدارترین یاریزانە کە لە ژیانمدا ناسیومە".

کیڤ کیگانی یاریزانی ناوداری ئینگلیزییش بۆچوونەکەی لینیکەر پشتڕاست دەکاتەوە و دەڵێت: "سەیری زیدان بکەن، دواتر بیر بکەنەوە، بزانن پێشتر یاریزانێکی هاوشێوەی ئەوتان بینیوە..مارادۆنا یاریزانێکی گەورە بوو، یۆهان کرۆیفیش بە هەمان شێوە، ئەوان جیاواز بوون، لەگەڵ زۆرترین لێکچوونی نێوانیشیاندا، بەڵام

زیدان لە پێشترە و یەکەمە، چونکە بە شێوازێک یاریی بە تۆپ دەکات، وادەکات پانتایی بۆ خۆی دابین دەکات، کە لە بنەڕەتدا بوونی نییە، ئەو یاریزانێکی زۆر تایبەتە، روانین و بینینێکی وای هەیە، وادەکات یاریزانێکی زۆر جیاوازبێت لە مێژوودا".

دواتر چی؟ زیدان لەو بێتاقەتییە بێزار بوو، کە کۆتایی بۆ نەبوو، هەروەها لەو شێدارییەی سنووری نەبوو، دوای چەند وەرزێک یاریکردن لە یوڤی، هەوڵی دا گۆڕانکاریی بکات..کێ شوێنی کارلۆ ئانچیلۆتی دەگرێتەوە؟ زیزۆ بایەخ بەمە نادات..مارچێلۆ لیپی دێت؟ بە هەمان شێوە جێی بایەخ نییە..ئەمانە هیچ لە کار و ئامانجەکەی ناگۆڕن، هەستەکانی ناجولێنن، هەروەکو چۆن واناکەن هەڵیبوەشێنێتەوە، بەڵام کارەکەیان دوادەخست، لەگەڵ ئەوەشدا شەڕی لەگەڵ ناخی خۆی دەکرد، کە داوای لێ دەکرد بمێنێتەوە، لە هەمان کاتدا سوپایەک لە رۆژنامەنووسانی بەدرۆ دەخستەوە، کە گرەویان لەسەر رۆیشتنی زیزۆ کردبوو، دوای ئەوەی فنجانە قاوەی مێرکاتۆیان خوێندبووەوە، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی زیدان هەستی بەوەکرد رۆیشتنی تەنیا لە دەست خۆی نییە و تەنیا بڕیاری ئەو نییە، تەنیا پەیوەست نییە بە ئەو، بەڵکو لە ماڵەوەش ڤیرۆنیکای هاوژینی و ئینزۆی

شەش ساڵان و لوکای تەمەن سێ ساڵان هەن و ئەوانیش پەیوەستن بە بڕیارەکە.

زیزۆ دوایاریی خۆی لەگەڵ یوڤی بەرامبەر ئەتەلانتا ئەنجام دا، کە تیپەکەی بە دوو گۆڵ یارییەکەی بردەوە، دوای ئەوە خۆی بۆ خەمی درێسێکی نوێ تەرخان کرد، ئەو درێسە کامەیە؟ ڕەنگی چۆنە؟ لۆگەکەی چۆنە؟ ئەستێرە زێڕینەکانی سەر سینگی چەندن؟ کەس نازانێت، تەنیا خۆی نەبێت.

# بەشی پێنجەم

## دەستەسڕی فریودان

### ئەو یاریزانەی بزنسمانەکانی ماندوو کرد

شاری تۆرینۆی ئیتاڵیا بۆ خانمە ئیسپانییە فەڕەنساییەکە، هاوژینی زیزۆ، خاتوو ڤیرۆنیکا فێرناندیز ئیتر ناخۆش بوو، لێی دڵتەنگ ببوو، لێی بێزار ببوو، دووساڵیش بوو هەمیشە نارەزایی لە مانەوەی لەوێدا دەردەبڕی، هێزی زیاتری نەمابوو لەوێدا بمێنێتەوە، جگە لەوە بە منداڵی سێیەمی دووگیان بوو، (تیۆ) لە ڕێگەدایە بۆ هاتنە ژیانەوە.

ڤیرۆنیکا بە زیدانی گوت: "ئەم منداڵە ناهێنمە ژیانەوە، تەنیا لە ئیسپانیا نەبێت، لەلای داپیرەم ماریا ئەمبارۆ".
ڤیرۆنیکاش وردەکاریی چیرۆکەکەی دەزانی، دەیزانی چی

ڕوویداوە، زیزۆ خۆی بۆ ڕۆیشتن هانی دابوو، هەروەکو چۆن هانی خۆی دەدا، چاوەڕێی کات و ساتەکانی دەکرد، بەڵام خۆی خستبووە کێشەیەکەوە، گرێبەستە نوێیەکەی لەگەڵ یۆڤێنتۆسدا واژووی کردبوو، تاوەکو ساڵی 2004 کۆتایی نەدەهات.

ئەوکاتیش لۆچیانۆ موجی، ڕێوییەکەی یوڤی وەکو تووتییەک هەر ئەو دەستەواژەیەی دووبارە دەکردەوە "خەونی پێوە مەبینن، دەستبەرداری نابین"، بەڵام دواتر ئەویش تێگەیشت زیزۆ لە یانەکەیدا نامێنێتەوە، کە تەمەنی گەیشتبووە 29 ساڵان، بڕوای بەوە هات ئیتر شەمەندەفەری ڕۆیشتنی هاتووە، هیچ بژاردەیەکی دیکە نییە، هیچ چارەیەکی دیکە نییە، ئەمەش وایکرد موجی لەسەر تەلی پارە یاریی بکات، بۆ ئەوەی زۆرترین پارە لە گیرفانی شەیدابووەکان دەربهێنێت، ئەمەش لە پێناو ئەوەی گرێبەستی دیکەی گەورە بۆ یوڤی ئەنجام بدات و تیپەکەی بۆ وەرزی نوێ لەگەڵ مارچێلۆ لیپیدا بەهێز بکاتەوە، کە گەڕابووەوە یانەکە، کە ئامانجیشی قەرەبووکردنەوە بوو، دوای شکستەکانی سێ وەرزی ڕابردوو، ئەمەش لە مانگی حوزەیرانی 2001دا بوو، بەڵام ساڵێک پێش ئەم ڕێککەوتە و ڕێک لە ئاهەنگی ساڵانەی تۆپی زێڕیندا، لە مۆناکۆ چی ڕوویدا؟

زیدان و فلۆرێنتینۆ پێریزی سەرۆکی یانەی ریال مەدرید لەسەر یەک مێز دانیشتبوون، کە چەند کەسێکی دیکەشیان لەگەڵدابوو، لە کاتی سەرقاڵبوون و بێ ئاگابوونی ئەوانی دیکە، ملیاردێرە بەڵێندەرە گەورەکەی ئیسپانیا، دەستەسرێکی بچووکی بۆ زیزۆ نارد و لەسەری نووسیبوو "دەتەوێ لە ریال مەدریددا یاریی بکەیت؟" پاشان دانیشتەوە و چاودێری کرد و چاوەڕوان بوو، تا ئەو کاتەی وەڵامەکە هاتەوە "بەڵێ بێگومان"، ئەمە لە کاتێکدا بوو زیزۆ تازە گرێبەستەکەی لەگەڵ یوڤیدا نوێکردبووەوە.

زیزۆ زۆر شەیدای ڤیرۆنیکای هاوژین و خۆشەویستی ژیانی بوو، هاوڕێ و هاوڕێکە و دایکی دوو کوڕەکەی بوو، هاوبەشی هەتاهەتایی ژیانییەتی تاوەکو مردن، هەرچی لە توانایدا بێت بۆ رازیکردنی ئەو دەیکات، لە تۆرینۆش ژاوەژاوە، شێتەکانی تۆپی پێ هیچ باسێکی دیکەیان نییە جگە لە باسی زیدان، عاشقانی بیانکۆنێری هیچ دڵەڕاوکێیەکیان نییە، جگە لە دڵەڕاوکێ و ترسی ئەوەی کوڕە کەچەڵەکە بلیتێک ببڕێت و بەرەو مەدرید بچێت.

ماریا ئامبارۆ، ئافرەتێکی هەشتا ساڵانەی ئەندەلووسییە، بۆ زیدان وەکو دایک وایە، چونکە لەوکاتەوەی ناسیبووی،

خۆشیدەویست و ساڵانە لەگەڵ ڤیرۆنیکا و دوو کوڕەکەی لە ئالمیریا لە ئیسپانیا سەردانی دەکرد، ئەو ئافرەتەش رۆڵی گەورە و کاریگەری لەسەر ڤیرۆنیکا هەبوو، حەزی ئەوی دوو هێندە کرد لە رووکردنە ئیسپانیا و بەسەربردنی ژیان لەوێدا.

لەولاوەش خۆرخی ڤالدانۆ، بەڕێوەبەری وەرزشیی یانەی ریال مەدرید ئامانجی تیپەکەی ئاشکرا کرد، کە حەز و شەوقێکی زۆریان هەبوو بۆ ئەوەی زیدان درێسی یانەکەیان بپۆشێت، تەنانەت ئامانج و ویستی پێریز بوو لەوکاتەوەی کورسیی سەرۆکایەتیی یانەکەی وەرگرتبوو، بەڵام فرۆشتنی کەڵەشێرە گەورەکە لە لای جیۆڤانی ئانییڵی، بازرگان و خاوەنی کۆمپانیای ئۆتۆمبێل، کە خاوەنی یانەی یوڤێنتوسە، کارێکی ئاسان نەبوو، بە تایبەتی ئەوان تازە هەناسەیەکی فێنکی گرێبەستە نوێیەکەی زیدانیان هەڵمژی بوو لە نێو شەڕی گەورەی یانە گەورەکانی ئەوروپادا.

ئانییڵی لەگەڵ زیدان دانیشت، هەوڵی دا لە پرۆژەی کۆچکردن بەرەو ئیسپانیا پەشیمانی بکاتەوە، ئەوەشی دەزانی کارەکەی زەحمەتە، بەڵام هەوڵیشی دا.

ئانییڵی شکستیهێنا، لە لێدوانێکیشدا بۆ لاستامپا گوتی: هاوژینەکەی لە ماڵەوە سەرۆکە، ئەوە کێشەیە، ناتوانم



بەرامبەر ئەم کارە هیچ بکەم، زیدان لە مەینەتیدایە، چونکە لە ژێر کۆنترۆڵی ڤیرۆنیکادایە، ئەو ئافرەتێکی بەهێزە، هەمیشە ئەوە بەدەست دەهێنێت کە دەیەوێت، بە راشکاوی لە زیدانم پرسیوە لەماڵەوە کێ سەرۆکە، ئەو یان ڤیرۆنیکا؟!

زیدان لەو دانیشتنە هێمنەدا بەبێ ئەوەی رەنگی رووخساری بگۆڕێت، وەڵامی سەرۆکی یوڤی دەداتەوە: "سەبارەت بە من خانەوادە لە پێشەوەی هەموو شتێکەوە دێت، بارودۆخمان لە تۆرینیۆ باش نییە، هاوژینەکەم ئیسپانییە و حەزدەکات لەوێدا بژیت، منیش تۆپی پێی ئیسپانیام خۆشدەوێت، بەڵام ئەو بڕیار نادات، بڕیاری کۆتایی تەنیا بۆ منە، ئەویش گوێڕایەڵیم دەکات، چونکە منیش گرنگترین شتم لە ژیانی ئەودا".

لەگەڵ ئەوەی زیزۆ زۆر بایەخ بە پارەی زۆر نادات، بەڵام رەنگە هۆکاری کاریگەر هەر پارەی زۆر بێت، کە بڕیاری دا یوڤی جێبهێڵێت، هەرچەندە ئەو لە لێدوانێکدا مانگێک پێش مێرکاتۆی ئەو ساڵە بۆ رۆژنامەی ریپۆبلیکا دەڵێت: "زۆر لە بارەی بازاڕی گواستنەوە قسە ناکەم، بە لامەوە گرنگە نییە ببمە پیاوی شکاندنی ژمارە پێوانەییەکانی گواستنەوەی یاریزانان، سەیری ئەوانەش ناکەم کە زیاتر لە من پارە وەردەگرن، تەنیا بیر لە مووچەکەم دەکەمەوە،

یان بە لای کەمەوە بیر لەوانە دەکەمەوە لە من کەمتر وەردەگرن، کە بەداخەوە ئەوان ژمارەیان یەکجار زۆرە".

## پێنجشەممە 17ی ئایاری 2001

فلۆرێنتینۆ پێرێز سەرۆکی یانەی ریال مەدرید براکەی خۆی نارد بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ کارگێڕیی یانەی یوڤێنتوس و ئەنجامدانی گفتوگۆ، دەستەوارەی ریال مەدرید 50 ملیۆن دۆلار بوو لەگەڵ دەستبەرداربوون لە هەر سێ یاریزان، فلاڤیۆ کۆنسێساوی بەڕازیلی، کلود ماکالیلی فەرەنسی و میشێل سەلگادۆی ئیسپانی، بەڵام کارگێڕیی یوڤی دەستەوارەکەیان رەتکردەوە، بەڵکو داوای هەمان برەپارەیان کرد لەگەڵ دەستبەرداربوون لە لویس فیگۆی پۆرتوگالی، بۆیە رێکنەکەوتن.

## چوارشەممە 20ی حوزەیرانی 2001

موجی دوای مانگێک لە لێدوان و هەواڵ لە هەردوو وڵاتی ئیسپانیا و ئیتاڵیا، هاتە سەر هێڵ و گوتی: "زیدان

لە یوڤێنتوسدا دەمێنێتەوە، هەرچی دەگوترێ لە ئیسپانیا و ئیتاڵیا کاریگەریی بۆ سەر ئێمە نییە، میدیا و کەناڵ و رۆژنامەکان هەموو کارێک دەکەن لە پێناو گواستنەوەی زیزۆ بۆ ئیسپانیا، بەڵام ئەو یوڤی جێناهێڵێت".

## هەینی 22ی حوزەیرانی 2001

بەڕێوەبەری کارەکانی زیدان، ئالین میگلیاچیۆ بۆ رۆژنامەی مارکای ئیسپانی لێدوانی دا "ناتوانم شرۆڤەی بکەم و لە ئارەزووی یوڤێنتوس بۆ مانەوەی زیزۆ لە یانەکەیاندا تێبگەم، یاریزانەکە خۆی بڕیاریداوە، ئەوان بۆچی گواستنەوەی رەتدەکەنەوە؟

لە هەمان رۆژدا یانەی یوڤێنتوس بەیاننامەیەکی فەرمییان بڵاوکردەوە، تێیدا هاتبوو، لێدوانەکەی دوو رۆژ لەمەوبەری موجی گوزارشت لە بۆچوونی خۆی دەکات، ئەمەش پەیامێک بوو بۆ یانەی ریال مەدرید، کە یانەی یوڤێنتوس لە هەڵوێستی پێشووی پەشیمان بووەتەوە.



## چوارشەممە 27ی حوزەیرانی 2001

یوڤی هەموو لایەکی دووچاری سەرسوڕمان کرد بە بەیاننامەیەکی فەرمی لەسەر زاری بەڕێوەبەری جێبەجێکاری یانەکە، ئانتۆنیۆ جیرۆدۆ، کە گوتی: "زیدان بۆ فرۆشتن نییە، بەڵکو تازە گرێبەستەکەی بۆ پێنج ساڵی دیکە نوێکردووەتەوە، ئەمە بابەتی ژمارەکان نییە". ئەم بەیاننامەیە رۆژنامەوانییە جووڵەیەکی پیسی یانەی یوڤێنتوس بوو بۆ بەرزکردنەوەی نرخی زیدان بۆ بەرزترین نرخ.

## سێشەممە 2ی تەمووزی 2001

کۆبوونەوەیەکی نهێنی لە نێوان نوێنەرانی هەردوو یانەی ریال مەدرید و یوڤێنتوس بە سەرۆکایەتی فلۆرێنتینۆ پێرێز و لۆچیانۆ موجی لە شاری لۆگانۆ لە باشووری سویسرا کرا، تێیدا یوڤێنتۆس داوای 76 ملیۆن دۆلاری کرد (ئەوکاتە دەیکردە نزیکەی 90 ملیۆن یۆرۆ)، ئەو پارەیەش یەکجار زۆر و گەورە و سەرنجڕاکێش بوو،

لە هەمان کاتدا بێ ماناش بوو، چونکە لەوکاتدا بۆ وەرزشوانان ئاسان نەبوو ئەو جۆرە گرێبەستەکە هەزم بکەن.

دوای ماوەیەک گفتوگۆ، پێرێز توانی بڕوا بە شاندی یانەی یوڤێنتوس بهێنێت، کە ئەو پارەیەی داوای دەکەن، زێدەڕۆییەکی زۆری تێدایە بە بەراورد لەگەڵ بارودۆخی بازاڕی گواستنەوەی یاریزانانی تۆپی پێ و وەرزش بە گشتی، ئەمە جگە لەوەی لەو کاتدا قەیرانی ئابووری باڵی بەسەر ئەوروپادا کێشابوو.

موجی داوای لە پێرێز کرد دەستەوارەیەک بخاتەڕوو، کە پێی وایە گونجاوە بەرامبەر دەستبەرداربوونیان لە زیدان، کە تازە گرێبەستێکی نوێی لەگەڵ یوڤیدا واژوو کردبوو.

پێرێز دەستەوارەی کۆتایی خستەڕوو، بۆ ئەوەی کاتژمێرەکانی چاوەڕوانی لە مەدرید کۆتایی پێ بهێنێت، لە بەرامبەردا موجی، پەیوەندیی بە خاوەنی یانەی یوڤێنتوس جیۆڤانی ئانییڵی کرد وپێی گوت: "دەستەوارەی یانە ئیسپانییەکە 20 هێندەی ئەو پارەیەیە، کە یەکەمجار زیدانمان لە بۆردۆوە بۆ یوڤی گواستەوە لە ساڵی 1996دا، یاریزانەکەش نایەوێت لە لای ئێمەدا بمێنێتەوە، هۆکاری خۆیشی بۆ ئەمە هەیە، کە قەناعەتی ناگۆڕێت".

ملیاردە پیرەکەش بە ناچاری و بە ملکەچی رازیبوو.

## چوارشەممە 4ی تەمموزی 2001

فێرناندۆ مارتینا ئەلڤارێز. ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێڕیی ریال مەدرید لە زاری پێرێزی سەرۆکی یانەکەوە هەواڵێکی خۆش رادەگەیەنێت "زیدان بە رێژەی 99.9% بووەتە یاریزانی ئێمەیە، گفتوگۆیەکان لە بەرژەوەندیی ئێمەیە، ئەوەی ماوەتەوە وردەکاریی چۆنیەتیی پێدانی پارەکە و پێشکەشکردنی متمانەی داراییە".
لە هەمان کاتدا لۆچیانۆ موجی بۆ پەیامنێری رادیۆی ئیسپانیا گوتی: "هەفتەی داهاتوو بە شێوەیەکی فەرمی رایدەگەیەنین، پێموایە ئەو کارە یەکلابووەتەوە".
لەو کاتیشدا زیدان لەگەڵ خانەوادەکەی لە پشوودا بوو لە دوورگەی تاهیتی لە پۆلنیزیای فەرەنسا، چاوەڕێی پەیوەندییەکی موژدەبەخشی دەکرد ، ئەو دڵنیابوو ملیاردێرە ئیسپانییەکە، یەکێک لە ملیاردێرەکانی جیهان، سواری فڕۆکە تایبەتییەکەی نابێت مەگەر بۆ کۆتاییهێنان بە بەرەنگاربوونەوەی بەرپرسانی یوڤێنتوس نەبێت، بۆ ئەوە نییە قسەی بێ کەڵک ، یان لاواندنەوە بکات، کە

سوودی نییە.

کۆبوونەوەیەکی دیکە لە باخچەی ماندریا، لە ماڵی سەرۆکی فەخریی یانەی یۆڤێنتوس ئەمبێرتۆ ئانییلی، برا بچووکی جیۆڤانی ئانییلیی خاوەنی یانەکە کرا، پێرێزی سەرۆکی ریال و ڤاڵدانۆ تێیدا ئامادەبوون، هەروەها لە لای یوڤییەوە موجی لەگەڵ جیرۆدۆ و بێتیگا ئامادەبوون، بۆ ئەوەی خاڵ بخەنە سەر گرێبەستە مێژووییەکە، ئەمە لە کاتێکدابوو پێرێز لە کێشە و گرفتدا بوو، کە شاندی یوڤی پێیان نەدەزانی، بە جۆرێک ریال مەدرید پێویستی بە وەرگرتنی بەشە پارەیەک بوو، کە بە شێوەی قیست و خشتە بۆ دانراو وەریاندەگرت لە بری فرۆشتنی پارچە زەویی دیپۆرتیڤۆ سیوداد، کە شوێنی مەشق بوو، بە شارەوانیی مەدریدیان فرۆشتبوو لە پێناو دانەوەی قەرزی سەر یانەکە، کە نزیکەی 245 ملیۆن دۆلار بوو، پارەی زەوییەکەش 400 ملیۆن دۆلار بوو، کە گەورەترین پرۆسەی فرۆشتنی زەوی و زار بوو لە مێژووی مەدرید، شارە رازاوە و کلاسیکییەکە، لەگەڵ ئەوەشدا کۆبوونەوەکە لە چوارشەممەدا بوو، یانەی شاهانەش تاوەکو رۆژی هەینی هیچ برەپارەیەکی وەرنەدەگرت، بەڵام پێرێز بە شێوازی خۆی کێشەکەی چارەسەرکرد و کاتی زیاتری بەدەستهێنا، تاوەکو پارەی گرێبەستەکەی زیزۆ بدات.

ئەو کاتەشی شارەوانیی مەدرید پارەی رژاندە نێو خەزێنەی یانەی مەدرید، سەرۆک بەڵێنەکەی خۆی بەرامبەر جەماوەری یانەکەی بردەسەر و خۆی بەرامبەر رەتکردنەوە بەردەوامەکانی یوڤی بەدەستەوە نەدا، چونکە ئەو پیاوە شارەزایە و دەزانێت هەر شتێک نرخی خۆی هەیە. تەنانەت تۆڕی هەواڵی بی بی سی، ئەوەی لەو هاویندا روویدا، بە شەڕی مان و نەمان وەسفی دەکات. ئیتر رێککارییە تایبەتییەکان سەبارەت بە دڵنیاییە دارایییەکان جێبەجێکران، زیدانیش پشووەکەی کۆتایی پێ هێنا، چونکە کاتی رۆڵی ئەو هات لە دەستەوارەکەدا، بە فڕۆکەیەکی تایبەتی رووی لە مەدرید کرد و لە بنکەی سەربازی تۆریخۆن لە ئێوارەی یەکشەممەدا نیشتەوە. رۆژنامەی مارکا ئەوکاتە بڵاویکردەوە، هاتنی زیدان بۆ مەدرید لە رێگەی بنکەی سەربازی تۆریخۆن لە بری فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتیی مەدرید، بە نهێنی و لە ژێر چاودێریدابوو. ئەمەش بۆ ئەوە بوو هاتنەکە دوور لە چاوی وێنەگرەکان و قەرەباڵغیی هاندەرانی یانەی ریال مەدرید بێت.

خۆرخی ڤالدانۆ، بەڕێوەبەری وەرزشیی ریال مەدرید، زیدانی لەگەڵ بەڕێوەبەری کارەکانی گەیاندە ماڵی هاوڕێیەکی، دوای ئەوە لە بەیانی رۆژی دووشەممەدا



زیزۆ پشکنینی پزیشکی ئەنجام دا و لەسەر ماڵپەڕی خۆی لەسەر ئینتەرنێت بە فەرمی واژووکردنی گرێبەستەکەی لەگەڵ ریال مەدریددا راگەیاند، دووپاتی ئەوەشی کردەوە "گواستنەوەکە پەیوەستە بەو فاکسەی، کە لە لایەن یانەی یوڤێنتوسەوە دەنێردرێت و رەزامەندیی خۆیان لەسەر گرێبەست و دەستەوارەکە دەردەبڕن".

پێرێز لە لای خۆیەوە پەلەی بوو لە یەکلاکردەوەی خێرای دەستەوارەکە و پێشکەشکردنی یاریزانەکە بە میدیاکان، بە بیانووی ئەوەی زیدان پەیوەستە بە گەشتێک بەرەو مۆسکۆ، بۆ پشتگیریکردنی دۆسیەی پاریس بۆ میوانداریکردنی ئۆڵمپیادی 2008.

رەزامەندییەکە لە تۆرینۆوە گەیشت، دوای دڵنیابوون لە دروستیی هەموو رێککارییەکان و نەبوونی هیچ پێشێلکارییەک لەو خاڵانەی لەسەری رێککەوتبوون. دواجار یۆڤێنتوس بە فەرمی دەستبەرداربوونی خۆی لە زیدان بۆ ریال مەدرید راگەیاند بەرامبەر 77.5 ملیۆن یۆرۆ، کە ئەوکاتە دەیکردە 66 ملیۆن دۆلار، یاخود 48.4 ملیۆن پاوەند.

لە بەیاننامەکەی یوڤیدا هاتبوو، بەرپرسانی یانەی خانمە پیرەکە دەستبەرداری یاریزانەکە بوون لەسەر داوای خۆی، کە حەزی دێرینی یاریکردن بووە لە ئیسپانیا،

هاوكات سوپاسی زیدانیان كرد بۆ ئەو پێنج ساڵەی لە یانەكەدا یاریی كرد و خزمەتی زۆری یانەكەی كرد.
هەروەها دەزگەكانی راگەیاندن و ئاژانسەكانی هەواڵ، بە بایەخێكی زۆرەوە هەواڵەكەیان بڵاوكردەوە و گواستەوە وەكو گەورەترین گرێبەستی گواستنەوەی یاریزانانی تۆپی پێ لە مێژووی ئەو یارییەدا.
یانەی ریال مەدرید لە لای خۆیەوە میدیاكانی بۆ مەراسیمی ناساندن و واژووكردنی گرێبەستەكەی زیدان بانگهێشت كرد، ژانی چاوەڕوانیی لە مێشكی پێرێزی سەرۆكی ریال مەدرید كۆتایی هات، هەروەكو چۆن دڵەڕاوكێی سەر پەیژەكانی مەدریدێستا ون بوو، لەگەڵ ئەوەشدا پەلەكردنی پێرێز لە كۆتاییهێنان بە هەموو كاروبارەكانی گواستنەوەی زیدان، كێشەیەكی دیكەی دروست كرد، كاتێك بیریان چوو وەرگێڕێكی فەرەنسی بۆ كۆنگرە رۆژنامەنووسییەكە و واژووكردنی گرێبەستە مێژووییەكە ئامادە بكەن، هەر بۆیە بۆنەكە بە شێوەیەكی باش بەڕێوەنەچوو، بە جۆرێك زۆربەی رۆژنامەنووسەكان لە پرسیاركردن و وەرگرتنەوەی وەڵام لە زیدان بێبەش بوون و لە كارگێڕیی یانەی ریال مەدرید تورەبوون و لە رۆژنامە و میدیاكانیاندا باسی ئەو كەموكورییەیان كرد.
كۆنگرە رۆژنامەوانییەكە بە وتەیەكی فلۆرێنتینۆ پێرێز

دەستپێکرد: "بەم دواییە ڕاڵ مەدرید خەڵاتی باشترین یانەی لە مێژوودا بەدەستهێنا، بۆیە لەسەر ئێمە پێویستە زیدانی باشترین یاریزانی جیهانمان هەبێت، یاریزانە گەورە و شکۆدارەکان بۆ ئەوە لەدایک بوونە لەو یانەیەدا یاریی بکەن".

دواتر بواری بۆ میوانەکە ڕەخساند، زاوای مێژوو و تۆپی پێ، زەینەدین زیدان، کە بە پێکەنینەوە قسەی کرد، پێکەنینێک دڵ و چاوەکانی بۆ خۆی برد "شەرەفێکی گەورەیە بۆ من دریێسی ریال مەدرید بپۆشم، من بە ئارامییەکی زۆرەوە چاوەڕێی ئەو چرکەساتانەم دەکرد، پێنج ساڵی پڕ لە خۆشیم لەگەڵ یۆڤێنتوسدا بردەسەر، ئێستاش کاتێکی گونجاو بوو بۆ گواستنەوە، من ئێستا دڵخۆشم بە هاتنم بۆ دێرینترین یانە لە مێژوودا، زۆر سوپاس".

دواتر سەرۆکی فەخریی یانەی ڕیال مەدرید و ئەفسانەی یانەکە ئالفرێدۆ دی ستیڤانۆ هەڵسایەوە سەر پێ و درێسێکی یانەکەی لە دەست بوو، کە بە ژمارە 5 رازابووەوە، دیمەنێکی شکۆدار بوو، خانەی بەردەوامی یادەوەری تۆپی پێ و یادەوەریی هاندەرانی مەدریدی داگیر کرد، درێسەکە ژمارە 5 بوو، چونکە تەنیا ئەو ژمارەیە مابوو لە نێو ژمارەی درێسە سەرەکییەکانی

پێکهاتەی تیپەکە لە 1 تاوەکو 11، ئەمەش دوای ئەوەی یاریزانی بەئەزموون مانۆلۆ سانچێز وازی لە یاریکردن هێنا، کە لە بارەی ئەمەوە پێریز دەڵێت: جیاوازی لە نێوان یاریزانەکانی ریال مەدریددا نییە".

ئەم بۆنەیە کاتژمێر 3ی دوای نیوەڕۆ بوو، لە 6ی ئێوارەدا پێریز وردەکارییەکانی روونکردەوە و رایگەیاند گرێبەستەکە بۆ ماوەی 4 ساڵە و لەگەڵ ئەگەری درێژکردنەوەی بۆ یەک ساڵی دواتریش، بەهاکەشی 66 ملیۆن دۆلارە لەگەڵ بوونی سوود لە پرۆسەی پێدانی پارەکە بە سێ جار، لەگەڵ کرێی دەلاڵی، کە بەهاکەی 2.71 ملیۆن دۆلار بوو.

پێریز بۆ میدیاکان گوتی: "بە دڵنیاییەوە یانەکەمان لەم دەستەوارەیەدا سوودی گەورە دەکات، لە ناوەوە و دەرەوەی یاریگەدا، لە سەرەتادا هەندێک کەس دەڵێن نرخەکەی زۆر بەرزە، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ نرخەکە زۆر کەمدەبێتەوە کاتێک سەروەری بەدەست دەهێنێت، هیچ شک و گومانێکم نییە زیدان قازانجێکی زۆری وەرزشی و ئابووری بۆ یانەکەمان دەبێت".

لە رۆژانی سەرەتای هاتنی زیزۆ بۆ مەدرید و واژووکردنی گرێبەستەکەی بە فەرمی، نیو ملیۆن درێس، کە ناو و ژمارەی زیدانی لەسەر بوو، لە فرۆشگەکانی یانەکەدا

فرۆشران، نرخی هەر دانەیەکی 80 دۆلار بوو، هەروەها زیزۆ ناوی چووە نێو کتێبی گینیس بۆ ژمارە پێوانەییەکان و ژمارەی پێوانەیی تۆمارکراوی بە ناوی لویس فیگۆ شکاند، کە نرخی گرێبەستەکەی (56 ملیۆن دۆلار) بوو کاتێک لە هاوینی ساڵی 2000 لە بارسیلۆناوە رووی لە ریال مەدرید کرد.

مووچەی ساڵانەی زیدان لە مەدرید دوای دانی باج، 3.5 ملیۆن پاوەند بوو، کە دەیکردە 5.08 ملیۆن دۆلار، هەروەها نرخی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکەی زیزۆ 150 ملیۆن دۆلار بوو، گەورەترین نرخی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەست بوو لەو کاتدا، ژمارەیەکی سەخت بوو، لەو کاتدا هیچ کەسێک پێی دابین نەدەکرا، تەنانەت دێوەکەی ناو چرای سیحراوییش!

ئیتر خەڵکی شارەزای ئابوورییش نرخی گرێبەستە مێژووییەکەیان پشتڕاست دەکردەوە و شرۆڤەیان دەکرد، ئەوان نهێنییەکانی پشت پەردەی ژمارەکانیان دەزانی، هەموو ژمارەکان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، خەڵکیش راپۆرتە سەرنجراکێشەکانی ئەوانیان بینی و خوێندەوە. میدیای فەرەنسا گوزارشتی "مریشکەکە هێلکەی زێڕ دەکات"یان وەلانا، بەڵکو دەستیان بە بەراوردکاریی ئەو مووچەیە کرد، کە زیزۆ وەریدەگرێت، لەگەڵ ئەو



مووچەیەی کە بەرپرسانی وڵاتەکەیان وەریدەگرن، کە بۆیان دەرکەوت بۆ نموونە ئەو پارەیەی زیزۆ لە دوو هەفتەدا دەستی دەکەوێت، بەرامبەرە بەو پارەیەی کە بەرپرسی دامەزراوەی تەلەڤزیۆن لە فەرەنسا لە ساڵێکدا وەریدەگرێت.

هەروەها ئەگەر سەرۆکی کۆمپانیای زەبەلاحی فیفێندی بیەوێت ئەو پارەیەی دەستکەوێت، کە ساڵانە دەچێتە هەژمارەکەی زیدانەوە، ئەوا دەبێت داهاتی ساڵانەی جارانی 3 بکات، جگە لەوە، نرخی گواستنەوەی زیزۆ بۆ مەدرید، 400 جار لە نرخی گواستنەوەی پلاتینی بۆ یوڤێنتۆس زیاترە، کاتێک لە 1982 پەیوەندیی بەم یانەیەوە کرد، هەروەها نرخی گواستنەوەی زیزۆ، یەکسانە بە نرخی نوێترین فرۆکەی ئێرباس 321.

شیکردنەوە و لێکدانەوەی نرخی گرێبەستەکەی زیدان درێژەی هەبوو، لەوانە، مووچەی ساڵانەی بەشی مووچەی کرێکارێک دەکات بۆ ماوەی 6 هەزار ساڵ، هەروەها نرخی 360 ئۆتۆمبێلی جۆری فیرارییە، 300 هەزار ژەمە خواردنی یەکێک لە نایابترین هوتێلەکانی پاریسی پێ دابین دەکرێت، هەروەها 8 جار هێندەی خەرجیی نمایشێکی تایبەیی سەربازییە لە رۆژی نیشتیمانیدا، کە لە شەقامی شانزلیزێی پاریس ساز دەکرێت، هەروەها بە مووچەی

سالێکی، دەتوانیت 63 هەزار شەو لە هوتێلی نایابی ریتز بمێنیتەوە، ئەو هوتێلەی شازادە دایانا دواشەوی ژیانی لەوێدا بەسەربرد. جگە لەوە دەتوانیت 27 هەزار بلیتی چوون و گەڕانەوەی گەشتی تاهیتی پێ دابین بکەیت، کە زیدان عەشقی ئەو شوێنەیە، هەروەها دەتواندرێت بە شەمەندەفەری خێرا 600 هەزار گەشتی نێوان پاریس و مارسیلیای پێ بکات. ئەو شوێنەی کە دایک و باوک و چوار براکەی و هاوڕێیەکانی منداڵی تێدا نیشتەجێن لە لاکاستێلان.

لەوانەش سەیرتر، رۆژنامەی لادیبیشدۆمیدیی فەرەنسی نووسیبووی، بوودجەی وەزارەتی وەرزش و لاوانی فەرەنسا تەنیا بەشی کرینی حەوت دانە لە زیدان دەکات، یان تیپێکی تۆپی دەست. تەنانەت کەشتی فرۆکەهەڵگری شارل دیگۆل، کە فرۆکەکانی چەکی ئەتۆمی هەڵدەگرن، بە نرخی 40 گرێبەستی وەکو ئەوەی زیدان دەکرِدرێت، هەروەها بە پارەی گرێبەستەکەی زیزۆ دەتوانیت شەش یانەی تۆپی پێی پلەی دووی ئیسپانیا بکڕیت بە تەواوی یاریزانەکانییەوە.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا نووسەر و رۆماننووس ئەنعام کەچەچی دەڵێت: لەگەڵ ئەوەی زیدان دەست بۆ هەرچی ببات دەبێتە ملیۆنان دۆلار، بەلام ئەو زۆر دڵخۆشە

بەو یەک دۆلارەی، کە ساڵانە وەکو باڵیۆزی گەڕۆکی نەتەوە یەککرتووەکان بۆ نەهێشتنی هەژاری لە جیهاندا، وەریدەگرێت".

لە لای خۆیەوە رۆژنامەی تیلیگرافی بریتانی لە رێگەی یەکێک لە بەڕێوەبەرانی نووسینییەوە نووسیبووی "ئەو یارییە بەرەو شێتییمان دەبات، ئەو یاریزانە بلیمەتە نزیکە لەوەی ببێتە مۆنالیزی تۆپی پێ، ئەو شایستەی هەر پارەیەکە کە بۆی خەرج کراوە".

هەروەها یەکێک لە نووسەرانی ئینگلیز، لە لەندەن گاڵتەی بە یەکێک لە پسپۆڕانی تەندروستی کردبوو، کاتێک لە بەرنامەیەکی رادیۆدا بەشداری کردبوو، کە پسپۆڕەکە گوتبووی "بە نرخی گرێبەستەکەی سۆل کامبلی بەرگریکار، دەتوانین 200 ئامێری شووشتنی گورچیلە دابین بکەین"، ئەویش پێی گوتبوو "ئەی هەواڵی زیدانت پێ نەگەیشتووە؟!

رووداوی گواستنەوەی زیدان بۆ ریال مەدرید و گرێبەستەکەی، باڵی بەسەر تەواوی میدیای جیهاندا کێشابوو، تەنانەت ئەو رۆژنامانەی بایەخیان بۆ هەواڵی وەرزشیش نەبوو، روویان دەکردە مەدرید بۆ دروستکردنی ریپۆرت و بەدواداچوونی رۆژنامەوانی و دۆکیۆمێنتاری لەسەر گرێبەستەکە و وردەکارییەکانی.

دانییل پۆرستیرۆس رۆژنامەوان لە رۆژنامەی ئێل پاییسی بەناوبانگی ئیسپانی ئەو قسانە پشتڕاست دەکاتەوە و دەڵێت: "هەموو رەهەندەکان لەسەر ئەو رووداوە کۆک بوون، کە جادووگەرەکە دروستی کرد".

هاوکات هیچ کات رۆژنامەنووسەکان رەهەندی ئابووری ئەو گرێبەستەیان فەرامۆش نەکرد، بە جۆرێک بە دەیان رۆژنامە و ئاژانسی هەواڵی ئابووری و دارایی، وەکو هەواڵێکی پلە یەکی ئابووری، رووماڵی گواستنەوەکەی زیدانیان کرد، هەرچەندە هیچ پەیوەندییەکیان بە تۆپی پێ و وەرزشەوە نەبوو.

ئەوە تەنیا زیزۆ بوو توانی هەموو تیم و جۆرەکانی رۆژنامەوانی، بە شێوە و رەنگە جیاوازەکانیان و بە جیاوازیی کارەکانیانەوە، لەسەر سفرەی تۆپی پێدا کۆبکاتەوە.

هەر لە بەر خاتری چاوی زیزۆی مایسترۆدا، کارگێڕیی مێرنگی لەگەڵ یەکێک لە دامەزراوەکان بە ناوی "ریۆخا" لەسەر مێزی نووسینگەی ئەستۆپاکیی داهێنان و مارکە بازرگانییەکاندا کەوتە شەڕێکی یاسایی، هۆکارەکەشی ئەو پێشێلکارییە یاساییە بوو، کە دامەزراوەکە ئەنجامی دابوو، کە پێکهاتبوو لە تۆمارکردن و بەکارهێنانی ناوی زیدان لە فرۆشتن و برەوپێدانی کەلوپەلی وەکو پێڵاو

و جلوبەرگ و کڵاو، بە جۆرێک دامەزراوەکە لە مانگی ئایاری 1999 داوای کردبوو ناوی زیدان وەکو مارکەیەکی بازرگانیی خۆی تۆماربکات و داواکارییەکەشی لە ئابی 2000 رەزامەندی لەسەر درابوو.

نوێنەری دامەزراوەکە ئەوکات گوتبووی، ئەوە روونە نووسینگەی ئەستۆپاکیی داهێنان و مارکە بازرگانییەکان لە ئیسپانیا هیچ شتێک لە بارەی زیدان و ناوبانگی ئەوەوە نازانن.

ئەو کێشەیە خەریک بوو رێگە لە پرۆسەی فرۆشتنی ئەو درێسانە بگرێت، کە ناوی زیدانی بەسەرەوە بوو، یان بە لای کەمەوە زەرەری پێ بگەیەنێت، کاتێک رووی کردە یانەی شاهانە، تاوەکو ئەو کاتەی ئەو کێشەیە لە پەراوێزی یاسادا کۆتایی هات، مافی یانەی زەرەرمەندیش بوو مافی خۆی بە خێرایی وەربگرێتەوە، دواتر یانەی ریال مەدرید لە ململانێی یاسای بازرگانیدا توانی سەرکەوتووبێت، لە یەکێک لە دانیشتنەکانی دادگە، ئەمەش دوای دوو ساڵ لە دەستاودەستکردنی کێشەکە، کە تێیدا دامەزراوەکە بە پێشێلکردنی یاسا تۆمەتبار کرا و لە بری پێشێلکارییەک، دوو پێشێلکاری کردبوو، یەکێک بەرامبەر یاسای شارستانی و دووەمیش بەرامبەر بە یاسای بازرگانی، کە هەردوو بابەت رێگەپێنەدرابوو.

بەڵام دوای ئەمە چی ڕوویدا؟

زیدانی دڵگەورە و بەخشندە، لە مافی دارایی خۆی خۆش بوو، کە تیمی پارێزەرانی داوایان کردبوو، ئەمەش وانەیەکی بەپێز و گەورە بوو لە لێبوردەیی و لێخۆشبوون.

دوای نزیکەی مانگێک لە گواستنەوەی زیزۆ بۆ مەدرید، تیپی شاهانە ڕۆژی 4ی ئابی 2001 بە تەواوی ئەستێرەکانییەوە ڕوویان کردە یاریگەی نێودەوڵەتیی قاهیرە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی یانەی ئەهلیی میسری لە میانەی ئاهەنگەکانی هەردوو یانە، کە نازناوی یانەی سەدەیان لە هەردوو کیشوەری ئەوروپا و ئەفریقادا بەدەستهێنا.

هاتنی ریال مەدرید بۆ قاهیرە، بۆ جاری دووەم بوو لە ماوەی 40 ساڵدا، کە پێشتر لە مانگی ئاداری 1961دا تیپەکە لەگەڵ ئەستێرەکانی وەکو دی ستیفانۆ، پوشکاش، هیدیکۆتی و خینتۆ و ئەوانی دیکە چووبوونە قاهیرە و لەوێ دوو یارییان کردبوو، لە یاریی یەکەمدا بە چوار گۆڵ لە زەمالیکیان بردبووەوە و دواتریش بە حەوت گۆڵ سەرکەوتنیان بەسەر تیپی ئەستێرەکانی میسردا تۆمارکردبوو.

ڕۆژنامەنووسان پێش یارییەکە دانیشتن و پرسیاریان دەکرد، تیپێک کە نرخی ئەستێرەکانی پێنج ملیۆن جونەیهی

میسرییە، بەرامبەر تیپێک کە نرخی ئەستێرەکانی یەک ملیار جونەیهە، چی دەکات؟ ئەی بەرگریکارانی وەکو سەمیر کەممونە و وائیل جومعە بەرامبەر تیمی ئەستێرەکان چی دەکەن، چۆن بەرامبەر رۆبێرتۆ کارلۆس، فیگۆ، زیدان و رائوول دەوەستنەوە؟

لە راستیدا شەوێکی وەرزشیی چێژبەخش بوو، 66 هەزار هاندەر ئامادەبوون، یەکەم یارییش بوو بۆ راهێنەری ئەفسانەیی یانەی ئەهلی مانوێل جۆزێ.

بەڵام لە یارییەکەدا چی روویدا؟ سوپرازێکی گەورە روویدا، لە خولەکی 50دا یاریزانی نێجیریایی سەندای، دوای ئەوەی یاریزان حوسام غالی لە ناوەڕاستی یاریگەوە چەند یاریزانێکی ریال مەدریدی یاریی پێکرد و توانیشی سیزاری گۆڵپارێزیش ببڕێت و تۆپەکەی دایە سەندای و ئەویش بە ئاسانی کردییە گۆڵ.

دواجار هاورێیەکانی کاپتن هادی خەشبە توانیان سەرکەوتن بەسەر هاوڕێیانی فیرناندۆ هییرۆ و ئەستێرەکانی مەدریددا تۆماربکەن.

ئەزموونی زیدان لەگەڵ ریال مەدرید زۆر درێژ نەبوو بە پێوانەی زەمەن، بەڵکو تەنیا 5 وەرز بوو، هەروەها بە پێوانەی پاڵەوانیەتییەکانیش پڕ زێڕ نەبوو، بەڵکو تەنیا 6 نازناویان بەدەست هێنا، کە ئەگەر بە قەڵەم و کاغەز

هەژماری بکەین، دەکاتە 1.2 نازناو بۆ هەر وەرزێک.
بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەکو ئەفسانەیەکی راستەقینەی ریال مەدرید هەژمار دەکرێت لە تەک ئالفریدۆ دی ستیڤانۆ و فێرنتیس پوشکاش، لە کاتێکدا ئەوان باڵیان بەسەر هەردوو جەمسەری رۆژهەلات و رۆژئاوای تۆپی پێی ئەوروپادا کێشابوو.
پێموایە ئەو کاریگەرییەی زیزۆ جێی هێشت، ئەو خۆشەویستییەی کە بەدەستی هێنا، ئەو سەرسامییەی کە لە رووخساری عاشقانیدا نەخشاندی، هیچ ئەستێرەیەکی دیکەی مەدرید بە درێژایی مێژوو دروستی نەکردووە ، هەرچەندە ژمارە و دەستکەوتەکانیان زۆر بووبێت.
زێدەڕۆیی ناکەم ئەگەر بڵێم زیزۆ ئەو یاریزانە بووە، کە هەموو راهێنەرەکان خوازیاری بوونە، لە یەک کاتدا لە عەقڵ و دڵەکانیاندا نزیک بووە، ئەمەش بە هۆی بلیمەتیی بەهێزی، شێوازی باڵکێشی تاک و تەنیای، هەروەها بە هۆی شکۆی لە بڕیاردان و کاریزماکەی، کە بەهۆیەوە دەتوانێت سەختترین دوژمنەکانی وا لێ بکات چەپڵەی بۆ لێ بدەن و بۆی بچەمێنەوە.
ئەگەر پرسیار بکەن گرنگترین ئەزموونی زیدان لە بێرنابیۆدا چی بووە، ئەوا دەڵێم، ئەو تەنیا یاریی تۆپی پێی نەدەکرد، بە قەدەر ئەوەی شرۆڤەیەکی روونی بۆ

تەواوی جیهان و بۆ مێژوو دەنووسییەوە، لە بارەی مانای چێژی خۆی، لە بارەی سیحر و باڵکێشی و پێکەنینەکانی.
زیزۆ رۆڵی هەبوو لە گەڕاندنەوەی ریال مەدرید بۆ پلەی یەکەمی جیهان لە رووی جەماوەری و هاندەرانەوە، ژمارەی بینەرانی یارییەکانی ریال مەدریدی لە شاشەی تیڤییەکانەوە دوو هێندە زیاد کرد، لەگەڵ کاریگەریی تەواوی ئەستێرەکانی دیکەی تیپەکە، بەڵام ئەو ئەستێرەی گەورە بوو لە نێو کۆمەڵە ئەستێرەکەی یانەی شاهانەدا، شێوازی یاریکردنی دەگمەنی ئەو، لە وێنەی فیلمێکی پڕ سەرکێشی بوو لە 90 خولەکدا، وەکو نمایشێکی شانۆیی بوو، وەکو ئاهەنگێکی میوزیک و سەما بوو، وەکو رۆمانێک بوو، کە حەز نەکەی هەرگیزاو هەرگیز بگاتە کۆتایی.
تەنانەت وای کرد، ئەوانەی بایەخیان بۆ تۆپی پێ نەبوو، ئەوانەی کە دەیانگوت "نەخێر بۆ تۆپی پێ"، بڵێن "بەڵێ بۆ تۆپی پێ"، ئەمەش تەنیا لە پێناو قاچەکانی ئەو جادووگەرە پڕشنگدارەدا.
لەو سەردەمدا ریال مەدرید ناونرا "گالاکتیکۆس"، کە مانای "بەردە پیرۆزەکان" دەگەیەنێت، ئەمەش بە هۆی بوونی کۆمەڵێک ئەستێرەی گەورە لە تیپەکەدا، لەوانە زیدان، رۆناڵدۆ، فیگۆ، بێکهام، رۆبێرتۆ کارلۆس و رائوول

گۆنزالێز و چەند ناوێکی دیکە.

ئەو کۆمەڵە ئەستێرەیە ئەوەندە باڵیان بەسەر سەکۆی نازناو و پاڵەوانیەتییەکاندا نەکێشا، بە قەدەر ئەوەی باڵیان بەسەر دڵ و عەقڵەکاندا کێشا.

زیدان لەوێدا وەکو مامۆستایەک بوو، کە قوتابییەکانی هەر کاتێک کێشەیەکیان هەبێت، یان لە بابەتێک تێنەگەن، هانای بۆ دەبەن، یاریزانەکانی تیپەکەش لە لۆژیکی یاریدا کاتێک دەکەونە تەنگەتاوی و کێشەوە، یەکەم کار کە بیریان لێدەکردەوە، ناردنی تۆپەکە بوو بۆ زیزۆ، بۆ ئەوەی چارەسەری بکات، چونکە دەیانزانی ئەو تۆپەکە بە ئاسانی لە دەست نادات، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێک بەرگریکار لە کۆشکێکی بچووکی تەلەفۆنی سەرشەقامەکانی لەندەنیشدا بێت!

زیزۆ لە یەکەم دیڕی کاروانی وەرزشیی خۆی لەگەڵ ریال مەدریددا، بردنەوەی جامی سوپەری ئیسپانیای نووسییەوە، پێش ئەوەی خەونی تاکەکەسی خۆی بە بردنەوەی نازنازی چامپیۆنزلیگی ئەوروپا بهێنێتە دی بە تۆمارکردنی گۆڵێکی ئەفسانەیی لە تۆڕی بایەرلیڤەرکووزنی ئەڵمانی، کە ئەو گۆڵە لەم ئێوارەیەدا لە هزر و خەیاڵی هیچ بینەرێکی یارییەکەدا نەبوو لە یاریگەی هامپدن پارکدا لە گلاسکۆ، بەڵام تیپەکە یاریی کۆتایی جامی شای

ئیسپانیای دۆڕاند و دواتریش لە گەڕی 34ی لالیگاشدا پلەی یەکەمی ریزبەندییان لە دەست دا.

وەرزەکە زۆر تایبەت بوو، رۆژنامەکان هەر خەریکی باسکردن و نووسین بوون لە بارەی گۆڵەکەی زیدانەوە، نووسەری ئینگلیزی دیڤید لیسی دەڵێت: "مووشەکێکی بالیستی بوو لە قاچی چەپییەوە دەرچوو، ئەگەر گۆڵپارێزی لیڤەرکووزن هەستی بە بایەکی بەهێز کردبێت، بێگومان ئەوە هی ئەو تۆپە بەهێزە بووە".

هەروەها تۆڕی هەواڵی بی بی سی لە دوای یارییەکە نووسیبووی "زیدانی ئەفسانە".

فیڵ ماکنۆڵتیی نووسەر نووسیبووی: "زیدان ئەمڕۆ لە نێوان هەردوو زەبەلاح دی ستیڤانۆ و پوشکاشدا وەستاوە، تۆ دەتوانیت گۆڵە سەرنجڕاکێشەکەی زیزۆ بە گۆڵەکەی مارادۆنا لە تۆڕی ئینگلتەرا لە ساڵی 1986 وەسف بکەیت، یان بە بەرپەرچدانەوەکەی گۆردن بانکس بۆ تۆپەکەی پێلێ لە مۆندیالی 1970 وێنا بکەی، ئەو ساتە جادووگەرانەییەی زیدان تاهەتایە شوێنی خۆی لە کەلەپووری خولی پاڵەوانانی ئەوروپادا دەگرێت".

ماکنۆڵتی، بوونی تۆپ لە نێو قاچەکانی زیداندا بە "وێنەیەکی روون و ڕاستەقینە لە وێنەکانی جوانی و خۆشییەکان" وەسف دەکات.

هەر لە بارەی ئەو يارييە و گۆڵەكەوە، كلاوس تۆپمۆلەر ڕاهێنەری ليڤەركووزن دەڵێت: "هەرچەندە لە مەشقەكاندا پلان دابنێين، بەڵام هەندێك شتی تايبەت ڕوودەدەن، بێگومان گۆڵەكەی زيدان يەكێكە لەوانە. لەو ئێوارەيەدا ئيكەر كاسياس بە ئاستێكی زۆر بەرز دەركەوت، دوای ئەوەی لە خولەكی 68دا هاتە شوێنی سيزاری گۆڵپارێزی سەرەكی تيپەكە، كە بە هۆی پێكانەوە ياريگەی جێهێشت.
لە بارەی ئەوەشەوە، ماكنۆڵتيی نووسەر لە دوای يارييەكە دەنووسێت: "بەڵێ كاسياس چەند تۆپێكی زۆر زەحمەتی گەڕاندەوە، بەڵام زيدان ئەو پياوە بوو كە جياوازييەكەی دروست كرد".
لە لايەكی ديكەوە ڕۆب هيوز، نووسەر لە ڕۆژنامەی نيويۆرك تايمز دەڵێت: "تيمی هونەری لە يەكێتيی ئەوروپا، كە ڕۆژی دوای يارييەكە كۆبوونەوە، لەسەر ئەوە ڕێككەوتن، زيدان ئەو پياوەيە، كە خاوەنی هەموو شتێكە لە تۆپی پێدا"
هەروەها دەنووسێت: "ئەگەر زيدان بڵێت هيچ كات بيری لە لێدانی تۆپەكە بە شێوەی فڕيو نەكردووەتەوە، ئەوا 51 هەزار و 465 كەس لە نێو ياريگەدا شايەتن بۆ ئەوەی بيری لێ كردبووەوە، ئەمە دروستكراوی خۆی بوو، دروستكراوی بەخت نەبوو، وێنەكانيش ئەوە

دەسـەلمێنن چاوەکانی لەسـەر تۆپەکە هەڵنەگرتووە، کە لە ئاسمانەوە دەهاتە خوارەوە، لەو چرکەسـاتانەدا زیـزۆ خەریکی دابەشـکردنی کێشـی جەسـتەی بـوو، بـۆ ئـەوەی ئامادەبێت بـۆ ئاراستەکردنی مووشـەکەکە، ئـەم گـۆڵـە وانەیەکی گرنگە لە ئەکادیمیاکانی تۆپی پێدا، بۆ ئـەو منداڵانـەی هیـوای ئەوەیان هەیـە ببنە خاوەن سـەروەری و نەمری لـە یادەوەری تۆپی پێدا".

رۆژنامـەی ریپۆبلیکا، کە لـە ئیتاڵیا دەردەچێت، ئەویش لە لای خۆیەوە بە کورتی نووسـیبووی "زیدان، میسـۆی تۆپی پێیـە"، کە بـە زمانی فەرەنسـی واتـا "زیـدان گـەورەی تۆپی پێیە".

لە وەرزی دووەمـدا زیـدان لەگـەڵ رۆناڵدۆدا دووانەیەکی ترسناکیان پێکهێنـا، کـە ئەمـەی دوایـی لـە ریزەکانـی ئینتەرمیلانـەوە رووی لـە مەدرید کردبـوو، کـە بەیەکەوە رۆڵێکی گـەورە و راسـتەقینەیان بینـی لـە بردنـەوەی نازنـاوی خولـی ئیسـپانیا لـە وەرزی 2002-2003 بـۆ یانەکەیـان، کە بەیەکـەوە توانیـان 32 گـۆڵ لـە کـۆی 86 گۆڵی یانەکەیان تۆماربکەن، جگە لە دروسـتکردنی چەندین گـۆڵ و کاریگەرییـان لەسـەر ئاسـتی تیپەکەوە.

لەو کاتـدا دیل بۆسـکی خۆشـبەخترین راهێنـەر بـوو لـە جیهانـدا، ئیرەیی پـێ دەبـردرا بـە هـۆی ئـەوەی دوو گـەورە

ئەستێرەی لە پێکهاتەکەیدا هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا چەند رۆژانێکی رەش بەسەر مەدریددا تێپەڕین، دۆڕانی چاوەڕواننەکراو و شۆکهێنەر دووچاری تیپەکە بوون، لەوانەش شکستە گەورەکەی بەرامبەر مایۆرکا بە پێنج گۆڵ، لەو شەوەی، کە ناونیشانەکەی "تۆڵەسەندنەوەی ساموێل ئیتۆ" بوو.

زیزۆ لە وەرزی دووەمیدا لەگەڵ ریال، نازناوی جامی سوپەری ئەوروپا و جامی جیهانیی یانەکانی بەدەستهێنا، کە لە هەردوو یاریی کۆتاییدا لە فاینۆردی هۆڵەندی و ئۆڵیمپیای پاراگواییان بردەوە، هەر لەو وەرزدا بە باشترین یاریزانی جیهان دەستنیشانکرا و بە پێش هەریەکە لە تێری هێنریی هاونیشتیمانی و رۆناڵدۆ کەوت، ئەمەش سێیەم جار بوو ببێتە باشترین یاریزانی جیهان لە دوای سالانی 1998 و 2000.

هەر لەو کاتەدا یانەی ریال مەدرید تەواوی میدیای دونیای دووچاری شۆک کرد، کاتێک دوای یەک رۆژ لە بردنەوەی نازناوی 29ی لالیگای ئیسپانیا لەلایەن دیل بۆسکییەوە، رایانگەیاند گرێبەستی راهێنەرەکە نوێ ناکەنەوە، فلۆرێنتینۆ پێرێز لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ بی بی سی دەرکەوت و گوتی: "نیشانەکانی ماندووبوون لەسەر دیل بۆسکی دەرکەوتووە، دەمەوێت لەگەڵ ئێوەدا



راستگۆبم، بڕوامان وایە دیل بۆسکی ڕاهێنەرێکی گونجاو نییە بۆ داهاتووی تیپەکە".

دوای ڕۆیشتنی دیل بۆسکی لە مەدرید، لە ماوەی 4 ساڵی دوای ئەو، 7 ڕاهێنەر مەشقی تیپەکەیان وەرگرت، بەڵام تیپەکە هیچ نازناوێکی نەبردەوە، کە زۆرترین ماوەی وشکەساڵی بوو لە مێژووی تیپەکەدا، تەنیا لە ساڵی 2007دا تیپەکە لەگەڵ فابیۆ کاپێلۆی گەورە ڕاهێنەری ئیتاڵی نەبێت، کە گەڕایەوە لوتکەی لالیگا و نازناوەکەی بردەوە لەگەڵ یاریزانانی وەکو ئێمەرسۆنی بەڕازیلی و ڤان نیستلرۆی هۆڵەندی، بەڵام دوای بردنەوەی نازناوەکەش، ڕاستەوخۆ دوای کۆتاییهاتنی وەرزەکە، کاپێلۆ تیپەکەی جێهێشت .

تیپەکە دوای ڕۆیشتنی دیل بۆسکی، جارێکی دیکە لە چامپیۆنزلیگدا دووچاری بێ هیوایی بوو، کە وای لێهاتبوو تیپەکە لەو کاتەی لە ساڵی 2004 بەرامبەر مۆناکۆی فەرەنسی دۆڕا، هەموو جارێک لە قۆناخی 16داماڵئاوایی لە ڕکابەرییەکاندا دەکرد.

ئەم بارودۆخە تاوەکو ساڵی 2011 بەردەوام بوو، ئەوکاتەی خۆزێ مۆرینیۆی ڕاهێنەر ئەو گرێیەی کردەوە و کۆتایی بەو نەفرەتییە بەناوبانگە هێنا، کە دووچاری مێژووی ڕیال مەدرید بووبوو، کە بەرامبەر لیۆنی

فەرەنسی دەدۆڕا و بەربەستی قۆناخی 16ی نەدەبڕی.
هەروەها پێش ئەوە و لە 2004دا ریال لەگەڵ کارلۆس کیرۆشی راهێنەردا لوتکەی ریزبەندیی خولی ئیسپانیای گرت، تاوەکو ئەوکاتەی کارەسات روویدا و لە دوا پێنج هەفتەدا تیپەکە شکستی هێنا و لە پلەی یەکەمەوە بۆ پلەی چوارەم دابەزی و بەمەش نازناوەکەی بۆ ڤالێنسیا لە دەست دا.

ئەم پێشهاتە بۆ هاندەرانی لۆس گالاکتیکۆس زۆر سەخت بوو، دواتریش کارلۆس کیرۆشی پۆرتوگالی دوورخرایەوە، کە تەنیا 10 مانگ بوو مەشقی تیپەکەی لە ئەستۆ گرتبوو، پاشان ئەوانەی دوای ئەویش هاتنە سەر کار، سەرکەوتوو نەبوون، لەوانە خۆزێ کاماچۆی ئیسپانی، کە هەر زوو رایکرد، لۆکسمبۆرگۆی بەرازیلی، کە پرۆژەکەی شکستی هێنا "لاکێشەی سیحری"، هەروەها لۆپێز کارۆش زۆر بەردەوام نەبوو.

بەڵام لە قوڵایی شکستەکانی تیپەکە لە پاڵەوانیەتییەکاندا، لە نێو ئاڵۆزکاویی نسکۆ و لە نێو تەمی دۆڕاندنەکاندا، چەندین بیرەوەری و چیرۆکی چێژبەخش دروست بوون، چیرۆکی دڵخۆشکەر، کە ناونیشانەکەی "گوڵاوی زیدان"ـە.

# بەشی شەشەم

## فەڕەنسا بە قاچەکانی زیدانەوە بەستراوە!

### دوورخراوە لە وڵاتەکەیدا

لە سەرنجڕاکێشترین ئەو چیرۆکانەی، کە بە کاروانی وەرزشیی زیدانەوە بەستراوەتەوە، چیرۆکی ئەوە لەگەڵ ڕاهێنەری هەڵبژاردەی جەزائیر عەبدولحەمید کرمالی، کە ساڵی 1990 جەنگاوەرانی بیابان (هەڵبژاردەی جەزائیر)ی کردە پاڵەوانی ئەفریقا، دوای ئەوەی لە یاریی کۆتاییدا سەرکەوتنیان بەسەر نێجیریادا بەدەستهێنا.

وردەکاریی چیرۆکەکە بەم شێوەیە، زیدان بۆ ئەم ڕاهێنەرە پێشنیاز کرا بۆ ئەوەی بۆ هەڵبژاردەکەی بانگهێشتی بکات، کە ئەوکاتە ڕاهێنەرەکە هەلی ئەوەی هەبوو بیباتە تیپەکەیەوە و نوێنەرایەتیی زێدی ڕەسەنی

خۆی بکات لە پاڵەوانیەتییە نێودەوڵەتییەکاندا، بەڵام بە گوێرەی ئەوەی باسدەکرێت، عەبدولحەمید کرمالی رەتی کردووەتەوە و چەند کەموکورپییەکیشی لە زیزۆدا دۆزیوەتەوە، کە بەس بووە بۆ ئەوەی لە کەمپی مەشقی هەڵبژاردەکەی دووری بخاتەوە، هەروەها بەس بووە بۆ ئەوەی زیدان لە ناخیدا خەم و حەسرەت و پەشیمانی بکێشێت، کە ئامادەی مەشقەکانی تیپەکە بووە و وای لێکردووە، ئیتر جارێکی دیکە بیر لەو بابەتە نەکاتەوە. تەنانەت لە خەویشدا، ئیتر پێی باش بێت هەر لە شەقامەکانی برسیەتی و هەژاری و کۆچبەریدا بمێنێتەوە، کە لە مارسیلیادا لەگەڵ کۆچبەرانی دیکەی سەر بە وڵاتانی داگیرکراو لە لایەن فەرەنساوە، تێیدا گەورەبوو. دەگوترێت هۆکاری رەتکردنەوەی زیدان لە لایەن کرمالییەوە، سستیی زیزۆ بووە لە یاریکردندا، بۆیە توانای ئەوی بە دڵ نەبووە و واژووی لەسەر گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا کردووە.

ئەو چیرۆکەی لە سەرەوە گێڕامانەوە ، هەمووی لە چنینی خەیاڵی رۆژنامەکان بووە، کە لەسەر زاری راهێنەر عەبدولحەمید کرمالییەوە دروستکراوە، چونکە لەم ساڵانەی دواییدا زیدان لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا و لە میانەی سەردانێکی بۆ جەزائیر، تەواوی ئەو قسە



و چیرۆکەی رەتکردەوە و بابەتی بانگهێشتکردنی بۆ هەڵبژاردەی جەزائیری بە درۆخستەوە، دووپاتیشی کردەوە کە دواجار لە جەزائیر بووبێت. لە تەمەنی 14 ساڵیدا بووە، بەمەش عەبدولحەمید کرمالی بێتاوان دەرچوو لەو تۆمەتانەی خرابووە پاڵی بە دوورخستنەوەی زیزۆ لە هەڵبژاردەی جەزائیردا.

کرمالی لە لای خۆیەوە، ئەویش ئەو چیرۆکەی رەتکردەوە و بە جۆرێک لە گاڵتە و پێکەنینەوە دەڵێت: "ئەگەر ئەوەش راست بێت و زیدانم رەتکردبێتەوە، پێویستە سوپاسم بکەن، چونکە ئەو بڕیارەم رێگەی بە زیزۆ دا ببێتە پاڵەوانی جیهان و ئەوروپا لەگەڵ هەڵبژاردەی فەڕەنسادا، بەڵام لەگەڵ جەزائیردا رەنگە بەم جۆرە نەبووایە و ئاستی بەرز نەبووایە!"

کرمالی بە یەکێک لە گەورە و باوکەکانی تۆپی پێی جەزائیر دادەنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر فەڕەنسییەکان بڕوایان بەو چیرۆکە بهێنایە، ئەوا رەنگ بوو بەرزترین نیشانەی شەرەفی پێ بدەن، رەنگ بوو نیشانەی سوارچاکی بە بەرۆکیدا هەڵواسن.

تاوەکو ئەمڕۆش، بەشێک لە جەماوەری جەزائیر بڕوایان وایە زیدان دەیتوانی بۆ هەڵبژاردەی وڵاتەکەیان یاریی بکات و پێیان وایە بەرپرسانی تۆپی پێی ئەو وڵاتە

هەڵەیەکیان کردووە، کە وایان کردووە زیزۆ نەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی ڕەسەنی خۆی، پێش ئەوەی لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا هەڵبژاردەی فەڕەنسا بیباتە ریزەکانی خۆیەوە.

ئەو تێڕوانینە، زیدان لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی میرۆری بریتانی دوای چوونی بۆ یۆڤێنتوس، پاڵپشتی دەکات و دەڵێت: ئەگەر هەڵبژاردەی جەزائیر پێش هەڵبژاردەی فەڕەنسا بانگهێشتی منیان بکردایە، هەرگیز هیچ کەسێک نەیدەتوانی بیر لەوە بکاتەوە چیم بەسەر دێت".

زیدان بیر و هۆشی جەزائیرییەکانی داگیر کردووە و باڵی بەسەردا کێشاون، هەرگیز خەیاڵی ئەوانی جێنەهێشتووە.

# دوو ماچ لە یەکەم ژوواندا

دوای ئەو بێ هیواییە گەورەیەی، کە باڵی بەسەر ناوەندەکانی تۆپی پێی فەڕەنسادا کێشا لە ساڵی 1993دا بەهۆی سەرنەکەوتنی هەڵبژاردەی وڵاتەکە بۆ کۆتاییەکانی مۆندیالی 1994 لە ژێر سەرپەرشتیی جێرارد هۆییێی ڕاهێنەر، ئەمەی دوایی دەستی لە کار کێشایەوە، بەڵام پێش ئەوەی پۆستەکەی جێبهێڵێت، یاریزان دیڤید جینۆلای بە هۆکاری هێنانی بەدبەختی تۆمەتبار کرد و بە هۆکاری شکستی تیپەکەی دانا بەرامبەر بە هەڵبژاردەی بولگاریا، کە بە گۆڵێکی بێ بەرامبەر پێیان دۆڕان و نەگەیشتنە مۆندیالی ئەمەریکا.

هەڵبژاردەی فەڕەنسا لەو کاتدا لە سەردەمی ئێریک کانتۆنای ئەستێرەی گۆڵکاردا بوو، کە نەیتوانی شوێنگرەوەیەکی باش بێت بۆ میشێل پلاتینی، کە ئەمەی دوایی ساڵی 1987 وازی لە یاریکردن هێنا و کاریگەرییەکی



گەورەی بەسەر بیرەوەریی پاریسدا جێهێشت، ئەمەش بەهۆی بردنەوەی نازناوی جامی نەتەوەکانی ئەوروپا بۆ فەرەنسا لە ساڵی 1984 و بردنەوەی میدالیای زێڕی تۆپی پێی ئۆڵمپیادی لوس ئەنجلیس لە هەمان ساڵدا، هەروەها رکابەریکردن لەسەر بردنەوەی مۆندیالەکانی 1982 و 1986، کە ئەگەر نەفرەتیی ئەڵمانییەکان نەبووایە، ئەوا فەرەنسا نزیک بوو لەو نازناوانە.

فەرەنسا کە یۆرۆی 1984ی بردەوە، بەڵام نەیتوانی بگاتە کۆتاییەکانی یۆرۆی 1988، ئەم رووداوەش لە لایەن وەرزشوانانەوە بە ریسواییەکی گەورە سەیر کرا، کە نەدەبوو لێی بێدەنگ بن، تەنانەت بۆ پلاتینییش، کە وازهێنانەکەی لە دوای یارییەکەی بەرامبەر ئایسلەندا بوو، کە هەر لە دوای یارییەکەوە سەرنەکەوتنی فەرەنسا بۆ جامی ئەوروپای 1988 یەکلابووەوە.

ئەم رووداوە کاریگەریی بۆ سەر ژمارەیەک یاریزانی فەرەنسا هەبوو، لەوانەش کانتۆنا، کە لە مانگی ئابدا بڕیاردرا بە راگرتنی لە یاریکردندا و سزابدرێت، ئەمەش دوای ئەوەی لە چاوپێکەوتنێکی تەلەڤزیۆنیدا قسەی بە راهێنەری هەڵبژاردەی فەرەنسا گوت.

لە مانگی تشرینی دووەمی 1988 میشێل پلاتینی مەشقی هەڵبژاردەی فەرەنسای لە ئەستۆ گرت، دوای

دوورخستنەوەی ڕاهێنەر هینری میشێل لە ئەنجامی یەکسانبوونی تیپەکە لەگەڵ قوبرس لە پاڵاوتنەکانی مۆندیالی 1990، کە فەرەنسا تێیدا زۆر بە خراپی شکستی هێنا و لە کۆتایی پاڵاوتنەکاندا تەنیا 2 خاڵی بەدەست هێنا.

پلاتینی لەگەڵ تیپەکەدا دەستبەکار بوو، توانیشی جێ پەنجەی خۆی بەسەر تیپەکەدا جێبهێڵێت، کاتێک لە 19 یاریدا نەدۆڕا لە ماوەی 29ی تەمموزی 1989 تاوەکو 19ی شوباتی 1992، تاوەکو ئەو کاتەی لە یارییەکی دۆستانەدا بە ئینگلتەرا دۆڕان.

لەگەڵ ئەوەشدا فەرەنسا لە کۆتاییەکانی جامی ئەورووپای 1992 شکستی هێنا، دوای دوو بەرامبەربوون لەگەڵ سوید و ئینگلتەرا، دواتر شکستی لەگەڵ دانیمارک، دوای ئەمەش بە هەفتەیەک، فیدراسیۆنی تۆپی پێی فەرەنسا میشێل پلاتینی لە ئەرکەکەی دوورخستەوە بە هۆی دەرچوونێکی تاڵ لە پاڵەوانیەتییەکە و ڕووخانی خەونی فەرەنسییەکان. کە چاوەڕێی بردنەوەی نازناوەکەیان دەکرد بە هۆی ئەو وێنایەی کە لە هزری خۆیاندا بۆ تیپەکەیان کردبوو لە پاڵاوتنەکاندا، بە تایبەتی بە چاوساغیی میدیای وڵاتەکەیان، کە هەر زوو پێیان وابوو جامەکە دەگەڕێتەوە پاریس.

هەموو ئەو شکست و کەوتنانەی هەڵبژاردەی فەڕەنسا، کە لە ماوەی نێوان ساڵانی 1987 تاوەکو 1994 دووچاری بوو، بووە کۆد و وشەیەکی نهێنی، کە راهێنەر ئیمی جاکیێ توانی بە روونی بیخوێنێتەوە، وشەیەکی نهێنی، کە ئاماژەی بەوە دەکرد هێزێکی ناسروشتی بۆ تیپەکە پێویستە بوونی هەبێت، ئەستێرەیەکی گەورە و سوپەر پێویستە بوونی هەبێت و کاریگەرییەکەی ئەوەندە گەورەبێت، کە لە پلاتینییش زیاتر بێت.

17ی ئابی 1994، خولەکی 63ی یاریی فەڕەنسا بەرامبەر کۆماری چیک، زەینەدین زیدان هاتە نێو یاریگە، بەهرەمەندێک کە پێدەچوو فەڕەنسا لە رێگەی ئەوەدابێت پشتی پێ ببەستێت، بە تایبەتی کاتێک توانی ئەنجامی یارییەکە لە 0-2 بۆ چیک، بگۆڕێت بۆ یەکسانبوون بە 2-2 گۆڵ، ئەمەش لە رێگەی ئەو دوو گۆڵەی لە یارییەکەدا تۆماری کرد، دوو گۆڵ بە دوو تۆپی مووشەکئاسا، کە هەر وەکو دوو ماچ بوو لە روومەتی کەڵەشێرە خەمبارەکەدا.

# گەمژەیی پیدرۆس هێرشی یەکەمی ئەوی تێکدا

لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا زیدان بەشێک بوو لە پلانەکانی هەڵبژاردەی کەڵەشێرەکان، هەروەها بەشێکی جیانەکراوە بوو لە خەونی فەرەنسییەکان، لە کاتێکدا ئێریک کانتۆنا هەموو پاریسییەکانی بێ هیوا کرد، ئەمەش دوای دەستدرێژییە بەناوبانگەکەی بۆ سەر هاندەرێک لە یارییەکی مانچێستەر یونایتد بەرامبەر کریستاڵ پالاس. لەو کاتدا گرنگیی زیدان دوو هێندە زیاتر بوو، بە جۆرێک بووە مایسترۆی هێڵی ناوەڕاست و هەلی گۆڵکردنی بۆ هاوڕێیەکانی لە هەڵبژاردەکەی بە قاچەکانی دروست دەکرد، هەر ئەمەش وای کرد خۆی لە پێشەوەی هەموو یاریزانانە ببینێتەوە، کە ڕاهێنەر ئیمی جاکیێ بانگهێشتی کردن بۆ بەشداریکردن لە جامی نەتەوەکانی ئەورووپای 1996 لە ئینگلتەرا.



لە پاڵەوانیەتییەکەدا زیزۆ سەرکردایەتی فەرەنسای کرد بۆ گرتنی پلەی یەکەمی کۆمەڵەی دووەم، کە لە کۆمەڵەکەدا بەرامبەر رکابەری زۆر بەهێز یارییان کرد، ئیسپانیا، بولگاریا و رۆمانیا، هەروەها لە قۆناخی هەشتدا لێدانە یەکلاکەرەوەکانی بەخت بە رووی کەڵەشێرەکاندا پێکەنی، کاتێک لە هۆڵەندایان بردەوە و بەخت یاوەری سیدۆرف نەبوو لە جێبەجێکردنی لێدانەکەیدا، بەڵام لە قۆناخی پێشکۆتاییدا ئەمجارەیان بەرامبەر کۆماری چیک بەخت لەگەڵ کەڵەشێرەکاندا نەبوو، کاتێک لێدانێکی گەمژانەی ڕیناڵد پیدرۆس تیپەکەی بەرەو دۆڕان برد و خەونی فەرەنسییەکانی لە گۆڕ نا، هاوکات کاروانی وەرزشیی پیدرۆسیش دووچاری نووشستێکی مێژوویی بوو، لە چاوی فەرەنسییەکاندا مرد، ئەو قەڵەمانەشی کە بە شانوباڵیاندا هەڵدەدا بۆ رکابەریکردنی زیدان، هەر ئەوان ئەرکی لە گۆڕنانیان لە ئەستۆ گرت.

# ژووانێکی تۆپی پڕ، زیدان بۆ کەڵەشێرەکان و تۆپی پێی ڕێکخست

لە هاوینی 1994دا، پێش ئەوەی ناونیشانی "یاریزانی نێودەوڵەتی" لە پێش ناوی زیداندا دابنرێت، ئەو لە ئەپارتمانەکەی خۆی لە شاری بۆردۆ، شاری جوانییەکی نووستوو، شاری شەراب، لە بەردەم شاشەی تەلەڤزیۆن دانیشتبوو بۆ بینینی مۆندیالی مام سام (مۆندیالی ئەمەریکا) و نەیدەویست لە یارییەکانی پاڵەوانیەتییەکە و وردەکارییەکانی بێ بەش بێت، بێگومان لە چرکەساتێکدا ئەوەشی بینی کاتێک رۆماریۆ و هاوڕێیەکانی، دوای 24 ساڵ دابڕان، جارێکی دیکە بەڕازیلیان گەڕاندەوە سەر تەختی تۆپی پێی جیهان، بێگومان داڕووخانی ڕۆبێرتۆ باجیۆشی بینی، کە لە ژێر خاڵێکی پەناڵتیدا نێژرا، بێگومان لەو کاتەدا زیزۆ کەوتە بینینی خەونێکی درێژەوە، زۆر دوور و درێژ، کە تاوەکو کاتژمێر 9ی



ئێوارەی رۆژی هەینی، 10ی حوزەیرانی ساڵی 1998 لێی بەئاگا نەهات، کاتێک لەگەڵ فیکەی ناوبژیوانی بەرازیلی مارسیۆ ریزیندی بە ئاگا هات، ئەو فیکەیەی کە بە ئاوازێکی بێزارکەرەوە بە گوێی زیزۆدا چرپاندی "ئەو خەونەی لەوەتەی پێش چوار ساڵ لە بۆردۆوە دەبینی، رەنگە لەسەر خاکی لۆژیکیی فەرەنسادا نەبینی".

دوای 36 خولەک، یاریگەی ڤیلدرۆم بە گەورەترین شێوە لەسەر گۆی زەوی هەژایەوە، لە خۆشیی ئەو تۆپەی زیزۆ بۆ سەر سەری دوگاری نارد و کردیە گۆڵی هەڵبژاردەکەی، وەکو ئەوەی زیزۆ بە پێکەنینەوە بە گوێی ریزیندیی ناوبژیوان بچرپێنێت، ئەو فیکەی سەرەتا لێی دا ، خەونەکەی نەپچڕاندووە، بەڵکو پێی گوتووە "لەسەر ئەرزی واقیعدا خەون ببینە، نەوەک لەسەر سەرین".

لە یاریی دووەمدا خەونەکانی هەڵبژاردەی فەرەنسا کەوتە ناوچەی مەترسییەوە، سەرەڕای سەرکەوتنێکی گەورە بەسەر هەڵبژاردەی سعودیە و ئاستێکی بەرز لە لایەن کەڵەشێرەکانی پاریسەوە، بەڵام زیدان بە کارتی سوور کرایە دەرەوە، دوای ئەوەی بە ئەنقەست بەسەر سکی کاپتنی هەڵبژاردەی سعودیە فوئاد ئەنوەر کەوت، دوای ئەوەی لە تۆپێکی هاوبەشدا بەریەک کەوتن، ئەم پێشهاتەش دەماری ساردی ئیمی جاکیێی

راهێنەری فەرەنسای لە بەفرگری دڵنیاییدا هێنایە دەرەوە و بە شێوەیەکی دەمارگرژانە لە میدیاکانەوە رەخنەی لە راگرتنی زیزۆ بۆ دوو یاری گرت و بڕیارەکەی بە ستەمکارانە وەسف کرد.

ئەو کاتەشی پرسیاری لێکرا ئایە جێگرەوەی زیدان کێ دەبێت لە پێکهاتەکەیدا، گوتی: "هەرگیز هیچ جێگرەوەیەکی نییە، دووبارە تیپەکەمان رێکدەخەینەوە و تاوەکو ئەو دەگەڕێتەوە، بە شێوازێکی جیاواز یاریی دەکەین".

فەرەنسا سەرکەوتنی بۆ قۆناخی دووەم مسۆگەر کردبوو، بەڵام راگرتنی هەڵگری ئاڵای خەونی فەرەنسییەکان بۆ دوو یاری، مانای ئەوەبوو تیپەکە لە قۆناخی 16دا لە ئەرکێکی یەکجار قورسدایە.

لەگەڵ ئەوەشدا کەڵەشێرەکان بەربەستی لاودروپ و شمایکل و هاوڕێیەکانیان بڕی، دواتر دوای چەند رۆژێکیش لۆران بلان ماچێکی لە سەرە کەچەڵەکەی فابیان بارتێزی گۆڵپارێزدا نەخشاند، پێش ئەوەی ناوبژیوانی ئیماراتی عەلی بوجسیم فیکەی کۆتایی یارییەکەی فەرەنسا و پاراگوای لە قۆناخی 16دا لێبدات، کە بە سەرکەوتنی کەڵەشێرەکان بە گۆڵێکی بلان لە کاتی زیادکراودا کۆتایی هات، ئەو گۆڵەی کە تریزیگێ بە پاسێکی سەر دروستی کرد و کۆتایی بە مەینەتیی فەرەنسییەکان هێنا بەرامبەر

بە بەختێکی خراپ و دەستەوانەکانی چیلاڤێرت.

لە یارییەکانی بەرامبەر ئیتاڵیا و کرواتیا، زیدان گەڕایەوە، بەڵام دوژمنان و رەخنەگرانی، هێرشێکی زۆریان کردە سەری و بە جۆرێک مامەڵەیان لەگەڵدا کرد، وەکو ئەوەی لێدانە سزاکەی بەرامبەر جیانلوکا بالیوکای لە دەست دابێت، یان وەکو ئەوەی وەکو گۆڵپارێزی دووەم لە نێو گۆڵی درازن لادیچی گۆڵپارێزی کرواتیا وەستابێت و دوو گۆڵەکەی تورامی گەڕاندبێتەوە، راستە زیدان لەو دوو یارییەدا ئەستێرەی یەکەم نەبوو، بەڵام هەرگیزیش بە خراپی یاریی نەکرد.

بەڵام ئەو، قەرەبووی هەموو ئەوانەی لە یاریی کۆتاییدا کردەوە، بە جۆرێک خەنجەری ئاستبەرزیی لە پشتی هەموو ئەوانە دا، کە گومانیان لە تواناکانی ئەودا هەبوو، هەروەها قاچی سەماکەرانی سامبای شکاند و پێی گوتن "ئەمشەو شەوی ئێوە نییە".

دوو لێدانی سەر، کە ئەفسانەکانی لێدانی سەر، لەوانە رۆد گۆلێت، ئۆلیڤەر بێرهۆف و ماجید عەبدوڵلا بەم شێوە جێبەجێیان نەکردووە و لە کاتەدا یەکلاکەرەوەدا ئامادەییان نەبووە، لە ژێر ئەو سوپا بەرگرییە تۆکمەدا نەیانتوانیوە بەربەستەکان ببڕن، لە کاتێکدا ئەو بەرگریکارانەی سامبا ئەو شنە بایەشیان چاودێریی دەکرد، کە زیدان

هەڵیدەمژی.

شەوێک، لە دروستکراوی جادووگەرەکە بوو، ئەو شەوەی هەرگیز لە یادەوەریی فەرەنسییەکاندا ناسرێتەوە، رەنگە فەرەنسییەکان مێژووی کردنەوەی تاوەری گۆستاف ئیفڵ لە بیر بکەن، مێژووی کۆماری پێنجەمی دیگۆل لە یاد بکەن، بەڵام هەرگیز ئێوارەی رۆژی یەکشەممە، 12ی تەمووزی 1998 یان لە یاد ناچێت، ئەو ئێوارە ژووانەی زیدان لە نێوان وڵاتەکەی و تەختی تۆپی پێی جیهاندا لە ستاد دوفرانس لە سان دۆنییێدا رێکی خست.

ئەو ژووانە تاوەکو ساڵی 2000 بەردەوام بوو، کاتێک فەرەنسا باڵی بەسەر نازناوی جامی نەتەوەکانی ئەوروپاشدا کێشا. کە زیدان لەو پاڵەوانیەتییەشدا رۆڵێکی باشی هەبوو، بە پێچەوانەی ئەوەی رەخنەگران باسی دەکەن، بە تایبەتی دوای ئەوەی دوو گۆڵی لە تۆڕی ئیسپانیا و پۆرتوگالدا تۆمارکرد.

بەڵام دوای ئەوە فەرەنسا لە مۆندیالی 2002دا شکستی هێنا و زیدانیش بە هۆی پێکانێکەوە، کە پێش پاڵەوانیەتییەکە دووچاری بوو، کەوتە سەر پێخەفی ئازارەوە و فەرەنساش بە ورەیەکی رووخاوەوە چووە نێو رکابەرییەکانی مۆندیال، هەروەکو پێشبینییش دەکرا، کەڵەشێرەکان بێ هیوا بوون.

لە راستیدا دەرچوونی فەڕەنسا لە مۆندیال زۆر شەرمەزارانە بوو، بەڵام زۆر لۆژیکییش بوو، چونکە فەڕەنسا بەبێ زیدان بەرامبەر سەنیگالی حاجی زیووفیش نەیتوانی سەری بەرزبکاتەوە.
لەبەر ئەوەشی کە شکستەکان، سەرکەوتنەکانی پێشتر لە تۆپی پێدا دەشارنەوە، ئەستێرەی زیدانیش کز بوو، هەروەها کاریگەریی ئەو و مۆرکی ئەو، کەوتە نێو مەرەکەبی میدیای وەرزشی لە هەموو جیهاندا، ئەمەش ئەنجامێکی سروشتی بوو بەهۆی ئەوەی فەڕەنسا نازناوەکەی لەدەست دا و رۆناڵدۆ و بەڕازیلیش لە کۆریای باشوور و ژاپۆندا درەوشانەوە.
پاشان لە یۆرۆی 2004دا زیدان بەڵێنی بە خۆی دا، ئەگەر نازناوەکە بەدەست نەهێنێت، ئەوا لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا واز لە یاریکردن دەهێنێت، لەو پاڵەوانیەتییەشدا تۆپێکی لە یادەوەری هەمووماندا تۆمارکرد، لە گرنگترین چرکەساتەکانی مێژووی خۆیدا، کاتێک لە ماوەی یەک خولەک و نیودا دوو گۆڵی لە ئینگلتەرا تۆمارکرد.
لێدانێکی راستەوخۆ، کە هەرگیز وێنەی نییە، دەگوترێت شارەزایانی تۆپی پێ لە ئینگلتەرا ئەو لێدانە راستەوخۆیەیان وەکو وانەیەک بە بێچووەشێران و منداڵانی تەمەن

بچووک دەڵێنەوە، هەروەها ڕۆژنامەی دەیلی تێلیگراف بەدواداچوونێکی زانستی بۆ گۆڵەکە ئەنجام دا، کە چەند زانا و فیزیکناسێک بەشدارییان تێدا کرد، ئەمەش بە ئامانجی ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیی تۆمارکردنی گۆڵی یەکەمی زیدان لە تۆڕی ئینگلتەرا، کە بە شێوازی لۆب بوو، هەمووانیشی هەڵخەڵەتاند.

فەڕەنسا لە پاڵەوانیەتییەکەدا زۆر دوور نەڕۆیی، چەقۆی یۆنانییەکان لەسەر ملی کەڵەشێرەکەی فەڕەنسا بوو، دواتریش شاکارێکی یۆنانیی گەورەیان نووسییەوە و لە کۆتاییدا نازناوەکەیان لەسەر شانی پۆرتوگالی خاوەنی یاریگە و میوانداردا بردەوە.

زیدان دوای یۆرۆی 2004 بڕیاری دا لە ئاستی نێودەوڵەتیدا واز لە یاریکردن بهێنێت، بڕیارێک، کە یەکێک لە قورسترین بڕیارەکان بوو لە مێژووی هاوچەرخی فەڕەنسادا، بڕیارێک مشتومڕێکی زۆری جەماوەری بەدوای خۆیدا هێنا، تەنانەن لەو کۆبوونەوە و دانیشتنانەی کە باسی تۆپی پێیشیان تێدا نەبوو، باسی بڕیارەکەی زیدان دەکرا، بڕیارەکەی زیزۆ واتا داڕووخانی زیاتری ئەنجامەکانی هەڵبژاردەی فەڕەنسا، تەنانەت وای لێهات گەیشتنی بە مۆندیالی 2006 کارێکی ئەستەم بوو، هەر بۆیە زیدان بڕیارەکەی هەڵوەشاندەوە و دووبارە قەیتانی لاپچینەکانی

(پێڵاوی وەرزشی) توند کردەوە و سەرکردایەتی تیپی وڵاتەکەی کرد و گەیاندییە مۆندیالی ئەڵمانیا، لەوێشدا و لە یاریگەکانی ئەڵمانیا، جوانترین دواچیرۆکەکانی خۆی لەگەڵ تۆپی پێدا نووسییەوە، کە بووە مۆندیالی زیزۆ، دوای ئەوەی شمشێری لەسەر گەردەنی مانگای ئیسپانیا دانا و جارێکی دیکە تۆپی پێی بەڕازیلی بە چۆک داهێنا و خەونی داگیرکارە پۆرتوگالییەکانیشی لە گۆڕ نا، بەڵام دواتر پشتی کردە جامی جیهانی و لە دواساتەکانی پاڵەوانیەتییەکەدا، دوای ئەوەی لە دیمەنێکی مێژووییدا کەللە سەرێکی لە سینگی ماتیرازی دا، گوتی "یەکەمجار شەرەف".

تەنیاش خوا دەزانێت رێچکەی یاریی کۆتایی مۆندیالی ئەڵمانیا چۆن بەڕێوەدەچوو، ئەگەر زیدان کارتی سووری وەرنەگرتبایە، کە لێی پەشیمان نەبووەوە و هەرگیزیش لێی پەشیمان نییە تاوەکو لە ژیاندا مابێت.

بەڵام دوای ئەوەی خەڵاتی باشترین یاریزانی مۆندیالی ئەڵمانیای بەدەستهێنا، زیزۆ داوای لێبوردنی لە فەرەنسییەکان و ملیۆنان بینەری یارییەکە و بە تایبەتی لە منداڵان کرد، بەهۆی ئەو کاردانەوەیەی بەرامبەر مارکۆ ماتیرازیی ئیتاڵی نواندی، بەڵام دووپاتیشی کردەوە، هەرگیز لەو کارەی پەشیمان نییە، چونکە پێی باش بوو

لەو یاریزانە بدات بەهۆی ئەوەی قسەی نەشیاوی بە دایک و خوشکی گوتبوو.

زیدان هەر لەم بارەیەوە بێدەنگی شکاند و لە تەلەڤزیۆنەوە دەرکەوت و گوتی: "وشەی زۆر قورسم گوێ لێ بوو، کە ناتوانم دووبارەی بکەمەوە، من پەشیمان نیم لە لێدانی ماتیرازی، چونکە قسەی زۆر نەشیاوی بە دایک و خوشکم گوت، کە چەند جارێک دووبارەی کردەوە، ئەو قسانە ئەگەر جارێک گوێت لێ بێت هەوڵ دەدەی جێی بێڵی و گوێی پێ نەدەی، هەروەکو منیش وام کرد، بەڵام ئەگەر جاری دووەم و سێیەم دووبارە بووەوە، نازانی چی بکەیت، بۆیە پەشیمان نیم لەوەی کردم، چونکە ئەگەر ئەوەم نەکردایە، ئەوا مانای ئەوەبوو، ئەو راست دەکات و من بەو قسانە رازیم".

زۆربەی جەماوەری وەرزشی لە جیهاندا هاوڕای زیدان بوون، دوای ئەوەی راستیی بابەتەکەیان بۆ روونبووەوە و بەرامبەر هەڵوێستە توندەکەی، لێی خۆش بوون، کە وای کرد جامی مۆندیال بخاتە دواوە لە بەرامبەر جامی کەرامەتدا، تەنانەت زیدان بڕوای وابوو ئەوانەی ئیدعای ئەوە دەکەن دەتوانن بەرامبەر پێشهاتێکی وا دان بەخۆیاندا بگرن، هیچ نین جگە لە کەسانێکی ترسنۆک نەبێت، چونکە مرۆڤی ئاسایی کاتێک دەرهەق بە دایک



و خوشکی ئەو جۆرە جوێن و قسە نەشیاوانەی گوێ لێ دەبێت، هەمان هەڵوێستی دەبێت، ئەگەر لە بەردەم دەرگەی مزگەوتیشدا بێت.

زیدان، گەورەی وانەی تۆپی پێیە، ئەو شەوە وانەیەکی بۆ تۆڵەکردنەوەی کەرامەت پێشکەش کردین، ئەوەشی بڕوای بە رەگ و رەسەنایەتیی خۆی نەبێت، ئەوا بێگومان لەو ئێوارەیەدا بڕوای پێی هەبووە.

# شمشێری کۆچبەرەکان

بەرپرسانی تۆپی پێی فەڕەنسا کاریان لەسەر ئەوە کرد سیستمی پێشخستنی یاریزانانیان هاوچەرخ بکەن، لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی رابردوودا لە پێناو ئەمەدا شێوازی هاوچەرخیان داهێنا، ئەمەش وای کرد بەرهەمەکەی بچننەوە، کە پلاتینی و هاوڕێیەکانی بوون. ئەو وڵاتەی کە لە ڕێگەی رۆژنامەنووسە پڕشنگدارەکەی "ژووڵ ریمیێ" لە ساڵی 1930دا جامی جیهانیی داهێنا، گەنجینەیەکی نیشتیمانییان دۆزییەوە، کە نرخێکی گەورەی هەیە، شارەزایانی تۆپی پێی فەڕەنسا لەوە تێگەیشتن تەنیا زیدان دەتوانێت پلاتینی لە یادەوەری فەڕەنسادا بسڕێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا تۆپی پێی فەڕەنسا لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو لە هێرشی توندڕەوەکانی پارتی راستڕەو رزگاری نەبوو، لە سەرووی هەمووشیانەوە جان باری

لۆبان، کە گوتی: "ئەو تیپە نیشتیمانییە قەڵبە، پێناچێت فەڕەنسی بێت، بەڵکو لە کۆمەڵێک یاریزانی ڕەنگاوڕەنگ پێکدێت".

بێرنار لاما، گۆڵپارێزی فەڕەنسا، کە لە دوورگەی گۆیانای باکووری رۆژهەڵاتی ئەمەریکای باشوور ، سەر بە داگیرکاریی فەڕەنسا لە دایک بووە و تاوەکو تەمەنی 18 ساڵی لەوێدا ژیاوە، بێدەنگ نەبوو، بەڵکو وەڵامی جان باری لۆبانی دایەوە و گوتی: "هەڵبژاردەی فەڕەنسا هەستێکی ئاوێتەی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی سامناک و لە هەمان کاتدا دادپەروەر و زۆر دەگمەن دەداتە هاونیشتیمانیانی".

مارسیل دیسایی لە غانا لە دایک بووە، کریستیان کارێمبۆ لە دوورگەی کالیدۆنیای نوێ، لیلیان تۆرام، زیدان و تریزیگێ لە فەڕەنسا لە دایک بوونە، بەڵام تۆرام منداڵی کۆچبەری دوورگەی گوادالوپن (داگیرکراوی فەڕەنسا)، زیزۆ بە رەسەن جەزائیرییە و تریزیگێیش ئەرجەنتینییە، هەروەها یۆری جۆرکایێف بە رەسەن ئەرمینیایی – پۆڵەندییە و دەگەڕێتەوە بۆ نەتەوەی کالمۆک، بەڵام زیدان و هاوڕێ کۆچبەرەکانی، ئەوانەی کە بنەڕەتدا فەڕەنسی نین، توانیان شکست بە بەرنامەیەکی تەواوی سیاسی بهێنن، کە لەسەر بنەمای رەگەزپەرستی و دژایەتیکردنی

ملیۆنان کۆچبەر و لێدانی بەرژەوەندییەکانیان بونیاد نرابوو.

ئەوە نەوەیە یارمەتیدەر بوون بۆ بەهێزتربوونی تێکەڵاویی کۆمەڵایەتی لە فەرەنسا، بە تایبەتی لە چەند بوارێکی جەمسەریدا، بە تایبەتی وەرزش، بە جۆرێک زیزۆ و هاورێیەکانی بوونە ئەو شمشێرانەی بەرگرییان لە کەرامەتی کۆچبەرەکان دەکرد، تەنانەت بۆ کۆچبەرێک کە سووکایەتی پێ بکرایە، ئەوەندە بەس بوو پێبکەنێت و بە بڕوایەکی گەورەوە تەنیا سێ وشە بڵێت و پرسیار لە رکابەرەکەی بکات "ئایە زیدان دەناسی"؟

# دوای 30 ساڵ لە هەڵاتن

باڵادەستی باوکەکان بەسەر بڕیاری کوڕە بەهرەمەندەکانیان و ڕێگەگرتن لێیان لەوەی یاریی بکەن، یەکێکە لەو هۆکارانەی وایانکرد ژمارەیەکی زۆر لە یاریزانانی بەهرەمەند بێبەش بن، کە دەیانتوانی ببنە ئەستێرەی بواری وەرزش.

ئەوانەشی کە خۆیان لە باڵادەستیی باوکەکانیان رزگارکرد، بێگومان فێڵی خۆیان هەبووە، یان دەوروبەرەکانیان یارمەتیانداون، یان بەدوای ئەو پەندە میسرییە کەوتوون، کە دەڵێت "زۆر بڵێیی و زۆر جەختکردنەوە، لە جادووکردن بەهێزترە".

زەینەدین زیدانی ئەفسانەی تۆپی پێ خەون و حەزی خۆی ناشارێتەوە بەوەی یەکێک لە چوار کوڕەکەی تۆپی پێ نەکەن و ڕوو لە بوارێکی جیاواز و زانستێکی دیکە بکەن.

بەڵام زیزۆ بڕیارەکەی بۆ کوڕەکانی جێهێشتووە و دەڵێت لە بەردەم دڵخۆشیی کەسیان ناوەستێتەوە، بەڵام ئەوەی لەسەریانە، پێویستە بزانن ئەو ڕێگەیە ئاسان نییە و باوکیان قورسترین مەینەتییەکانی تێدا بینیوە.

ئەو ئازادییەی زیدان بۆ کوڕەکانی، شتێکی نامۆ نییە، چونکە ئەو 30 ساڵ لەمەوبەر لە دەسەڵاتداریەتیی باوکی رای کردووە.

# وەکو جیاوازیی خۆر لەگەڵ گڵۆپی چینیدا!

شێوە و ناوەکان لە یەک دەچن، بەڵام لە نێوان نرخ و نرخ، ئاسمان و ڕێسمانە، پانتایی گەردوونی بە ژمارەی سەرسوڕهێنەر هەیە، لە نێوان بەخشش و بەخششدا، جیاوازی هەیە، جیاوازی وەکو خۆر و گڵۆپی چینی، یان جیاواز لەگەڵ ئەو چرایانەی هەڵدەواسرێن.

ئەگەر ئێمە ناوی زیدان بە یاریزانی تۆپی پێ بهێنین، ئەوا ماجید مورشیدی و عوبێد شەمرانی لە سعودیە، عەمرۆ سەمماکە و عاشور ئەدهەم لە میسر، پاتریک سیگان لە خەواجەکان، ئەوانیش پێیان گوتراوە یاریزانی تۆپی پێ. ئەگەر گەورەترین و شکۆدارترینی وەرزشوانان محەمەد عەلی کلای بێت، ئەوا مەمدووح فەرەجی میسریی کۆچکردووش، کە من خۆشمدەویست و سەیرم دەکرد، ئەویش ماوەیەک دوو دەستەوانەی بۆکسێنی لە دەستەکانی کرد، پێش ئەوەی حەزی نواندن هۆڵەکانی

بۆکسێنی پێ چۆڵ بکات.

ئەگەر موزیکی مۆزارتی مەزن لەسەر کاسێت و قەوان تۆمارکرابێت، ئەوا گۆرانییەکانی "شەعبولا"ی میسریش لەسەر هەمان شت تۆمارکراوە، هەروەها ئەو مێشکەی لە نێو سەری ئەنیشتایندا بوو، هەمان ئەو مێشکەش بووە کە لە نێو سەری تۆفیق عوکاشەدا بوو.

ئەوە سوننەت و ڕێچکەی ژیانە، ڕەنگە لەسەر گۆی زەویدا نموونەی دیێگۆ مارادۆنا لە شێوە و زمان بدۆزینەوە، بەڵام ڕەنگە ڕقی لە تۆپ بێت و هیچی لە بارەوە نەزانێت!

پرخەپرخەکەی بۆ ئەوانی دیکە جێ هێشت

مەشقی ڕۆژانەی زیدان لە بەیانیان و ئێواراندا دەگەیشتە 5 کاتژمێر، ئەمە جیا لەو خولەک و کاتژمێرانەی بۆ واژووکردن بۆ هاندەران و بۆنەی دیکەی تەرخان دەکرد، کە کارگێڕیی پەیوەندییە گشتییەکان و ڕاگەیاندن ڕێکیاندەخست، هەروەکو چۆن ڕۆناڵدۆ و ئەستێرە پیشەگەرەکە بەرێزەکانی دیکەش بە هەمان شێوە بوون.

وا پێویستیش بوو، کە ئەو پێشەنگی هەموو یاریزانەکان بێت، زیزۆ باش ئەوەشی دەزانی، کە مەشقەکانی بەیانیان وەکو "هێڵکەی نێو تەرازوو"ـە، کە بە مانای پاراستنی هاوسەنگی دێت، ئەگەر کارگێڕیی یانەکان کەمتەرخەمی

بکەن و خۆیان لە جێبەجێکردنی مەشقی بەردەوامی بەیانیان بدزنەوە و بە پێی میزاج و ئەنجامەکان ئەنجامی بدەن، ئەوا تیپەکان زەرەرمەند دەبن و گران لەسەریان دەوەستێت، ئەمە وای لێ دێت یاریزان ببێتە "بەڕێوەبەری گەورە" و کاتژمێرێک ئامادەبێت و کاتژمێرێک یاریی بکات، پاشان بە ملیۆنان دۆلاریش بڵێت "بەخێربێن بۆ هەژمارەکەم".

ئایە گەمژەیی و سەمەرە نییە کارگێڕیی یانەکان ساڵانە بە ملیۆنان دۆلار بخەنە هەژماری بانکی یاریزانە پیشەگەرەکان، کە بە تەواوی خۆیان بۆ تۆپی پێ یەکلاکردووەتەوە، کەچی رازی بن بەوەی رۆژانە تەنیا یەک کاتژمێر مەشق بکەن؟

ئەو "سەرین"ـەی کە زۆربەی یاریزانان پرخەپرخی بەسەردا دەکەن، زیدان بە هەموو شێوەیەک پشتگوێی خستبوو.

# بليمەتيى زيدان

ئەستێرەبوون و ناوبانگ، خانمێکی یارییێکەرە، رەنگە هیچ نامەیەکی دڵدانەوە بۆ یاریزان جێنەهێڵێت، کاتێک لەناکاو جێیدێڵێت.

دەستنیشانکردنی کۆتاییەکان لە تۆپی پێدا، بۆ یاریزان تاقیکردنەوەیە، کە کاریگەریی لەسەر وێنەی هزریی کاروانی ئەو دەبێت دوای چەندین ساڵ لە وازهێنانیدا، هەروەها کاریگەریی لەسەر جێگیریی ناوبانگەکەی دەبێت، کە لە کاتی راکردنی لەسەر چیمەنی یاریگەکاندا بەدەستی هێناوە.

زۆر یاریزانیش لەو تاقیکردنەوەیەدا شکستیان هێنا، تەنیا زیدان نەبێت، کە یەکێک لە جوانترین کۆتاییەکانی لە مێژووی تۆپی پێدا دروست کرد، کاتێک لەسەر لوتکە بوو "لە ژێرەوە هەموو لێی نزیک دەبوونەوە".

زیزۆ دەیتوانی ببێتە ئامێری پەیداکردنی پارە، دەیتوانی

لە هەر کوێ بێت و لە هەر کاتێکدا بێت، یاریی بکات و گوێ بە هیچ نەدات و تەنیا پارەی مەبەست بێت، بەڵام بلیمەتیی وەرزشیی ئەو، لە پێشەوە بوو، بڕیاری دا خاڵێک لە دواجوانترین دێڕدا دابنێت، لە بری ئەوەی لە کۆتایی ناشیرینترین دێڕدا دایبنێت.

# پاكۆ و پێڵاوی زیدان

هەندێک لە وەرزشوانان هەندێک لە هەڵسوکەوتی نائاسایی و منداڵکارانە و گەمژانە دەکەن، بەڵام لە دیمەنی کۆتاییدا باجەکەی دەدەن.

بۆ نموونە راهێنەری (پێشووی) یانەی رایۆ ڤاییکانۆ پاكۆ خێمنێز، هەموو کاروباری خولی ئیسپانیا و تیپەکەی و یاریزانەکانی جێهێشتبوو، خۆی بۆ ئەوە تەرخان کردبوو هێرش بکاتە سەر زیدانی ئەفسانەی تۆپی پێ و ئامادەبوونی ئەوی لە بواری مەشقدا بە "شەرمەزاری" ناوبرد.

بە هۆی ئەو لێدوانەشەوە توانی کات و پانتاییەکی باش لە رۆژنامە و تەلەڤزیۆنەکان داگیر بکات، تاوەکو ئەو کاتەی یۆهان کرۆیفی (کۆچکردوو) بەرامبەری وەستایەوە و لێدوانێکی ئاراستە کرد، کە لە دیوەزەمەی نێو خەودا خراپتر بوو!

لەگەڵ ئەوەشدا بێگومان بیری چوو ئەوە بە بیر پاکۆ خێمینێز بهێنێتەوە، کە ئێستاش پێلاوی زیدان (لاپچین – پێڵاوی وەرزشی) لە ئەو گرنگتر و جەماوەریترە، هەتاهەتایەش هەر وا دەمێنێتەوە.



# قوتابیی ئانچیلۆتی

کەم و دەگمەنن ئەو یاریزانانەی کاریگەرییەکی زۆر قوڵ لە هزری راهێنەران و پەڕاوی کاروانەکەیاندا جێدەهێڵن.

کارلۆ ئانچیلۆتی، وەکو هەر ئیتاڵییەکی دیکە، کە روو لە بواری مەشق دەکەن، لە سەرەتاوە پابەندی کاتاناچۆ (شێوازی بەرگریی ئیتاڵیا) بوو، بەڵام لە کۆتایی نەوەدەکاندا لەو شێوازە دەرچوو، دەستبەرداری وریایی ئیتاڵییەکان بوو، ئەمەش بە هۆی بوونی زیدانی ئەفسانەی زەبەلاح لە پێکهاتەی یوڤێنتوسدا.

ئانچیلۆتی بە پرسیارەوە دەڵێت: چۆن دەتوانم بە پلانێکی بەرگری یاریی بکەم، لە کاتێکدا باشترین یاریزانی ناوەڕاستم لە جیهاندا هەبێت؟

دوای سەرکەوتنی ئانچیلۆتی بە پلانێکی هێرشبەرانەی ترسێنەر لە وەرزی 2010دا، گوتی: "ئەم شێوازە لە زیدان فێربووم، ئەو بۆ ئەم رێگەیە رێنیشاندەرم بوو".

هـەر لـەو وەرزدا ئانچیلۆتـی لەگەڵ یانەی چیڵسیدا ژمارەی پێوانەیی گۆڵتۆمارکردنی شکاند، کە بە نـاوی یانـەی تۆتێنهامـەوە لەوەتـەی سـاڵی 1963ـەوە تۆمارکرابوو، دوای ئـەوەی تیپەکەی 103 گۆڵیان تۆمـار کـرد.

کێ پێشـبینیی دەکـرد راهێنەرێکـی ئیتالـی بتوانێت ئەم کارە بـکات؟ رەنگە تەنیـا زیدان پێشـبینیی کردبێت.

# مێسی و کریستیانۆ و زیدان!

شکاندنی ژمارە پێوانەییە تاکەکەسییەکان شتێکی لۆژیکی نییە بۆ هەڵگرتنی مۆمێک یان دانانی یەکێکی دیکە لە کێکی پێلێ و مارادۆنا و زیداندا، تەنانەت هۆکارێکی گونجاویش نییە بۆ ململانێکردنی پێگەی ئەوان، بۆ ئەوەی ببین بە ئەفسانە، ئەگەر سەروەریی بردنەوەی مۆندیال لە سەرووی کاروانەکە نەبێت.

جامی جیهانی هەلی کۆتاییە بۆ مێسی و رۆناڵدۆ. بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان ببێتە گەورە و شکۆدار لە مێژووی تۆپی پێدا لەگەڵ پێلێ، مارادۆنا، زیدان و رۆناڵدۆی بەرازیلیدا (دیاردە)، یان هەر یەکێکیان تەنیا لە لیستی سەرکەوتووان لەگەڵ یانەکانیاندا دەمێننەوە وەکو زیندانییەک. ئەوانە ئەگەر یادەوەری تۆپی پێ شتێکیان لە ژمارەکانیان بە نەمری بهێڵێتەوە، ئەگینا لە مێژووی میللەتاندا بە نەمری نامێننەوە.



بەراوردکاری لە نێوان ئەواندا، نە پێشدەکەوێ و نە دوادەکەوێ، بۆچی؟ چونکە شانۆی بەراوردکردن لە نێوان ئەم دوو ئەستێرەیەدا شتێکی تێدا ونە، ئەویش جامی جیهانییە، ئەو پاڵەوانیەتیە نایابە و پێگە بەرزە، کە نزیکە لە "هێڵکەی سەر تەرازوو" لە تەرازووی ئەوەی یەکێکیان ببێتە ئەفسانەی تۆپی پێ، یان نەبێتە ئەفسانە. رێگە بۆ گەیشتن بە پیلێ، مارادۆنا و زیدان، سەرەتا بە جامی جیهانیدا تێدەپەڕێت.

# دەیەم نازناوی مەدرید

ئەو کاتەی زیدان وەکو بەڕێوەبەری تۆپی پێ گەڕایەوە ریال مەدرید، جگەرەیەکی لە سەختی و توندی بە چەخماخی مێژوو هەڵکرد، پاشان ریال بەرامبەر جامە دوو گوێچکەکە بە حەزێکی زۆرەوە مژی لێدا و هەڵیکێشا.

ئەوکاتەش نووسیم:

لە ڕۆژانی چینییە کۆنەکاندا، کە دۆڕاویان جەلد دەکرد، بۆ ڕۆژانی ئینگلیزەکان، کە یارییان بە کەللە سەری دانیمارکییەکان دەکرد، بۆ کۆبوونەوەی چارەنووسسازی 1863، کە یاسا و شێوازی یارییەکەی دانا، بۆ گلۆسبیلیە لەسەر عەرشەکەی، بۆ موعجیزەی مارادۆنا لە ئیتاڵیا، بۆ تۆپلێدانە خەیاڵییەکەی زیدان بۆ تۆڕی هانز یۆرگ بۆتی گۆڵپارێزی لیڤەرکووزن، بۆ شەوێکی داهێنەرانە لە شەوەکانی مێژوو لە ئێوارەی 24ی ئایاری ساڵی 2014.

ریال مەدرید هەتاهەتایە وەکو یانەی شکۆدار و گەورەی یاریی تۆپی پێ لە مێژوودا دەمێنێتەوە.



# پاڵەپەستۆی دەروونی نازانێت!

لە نێو پاسدا، پێش یاریی کۆتایی مۆندیالی 1998 لە نێوان فەرەنسا و بەرازیلدا، بێدەنگی باڵی بەسەر هەمواندا کێشابوو، هەموو یاریزانەکان نزا و پاڕانەوەیان دەکرد، تەنیا زیدان نەبێت، ئەو گۆرانییە بەناوبانگەی گۆرانیبێژی ناوداری فەرەنسی میشال بۆلنارافی دەگوتەوە، کە دەڵێت "هەموومان دەچینە بەهەشتەوە"!

ئەو چرکەساتە بەڵگەیەکی دڵنیاکەرەوەیە لەسەر ساردیی دەمار و مێشکی ئەو، ئارامی ئەو پێش ئەو یارییە گەورەیەی، کە پڕە لە پاڵەپەستۆی دەروونیی ترسناک و زیاد لە پێویست.

بەڵام هەڵسوکەوتی ئەو بە شێوەیەکی ئەرێنی بەسەر هاوڕێیەکانی لە نێو یاریگەدا دەشکێتەوە، کە لە نێو یاریگەدا لە لوتکەی بڕوابەخۆبوون و ئاستبەرزیدا دەیانبینێت.

# تێڕوانینێکی جیاواز لە هەر ساڵێکدا!

هەرگیز کەس پێشبینیی نەدەکرد زیدانی تەمەن 34 ساڵان دەبێتە ئەستێرەی یەکەم لە جامی جیهانیی 2006دا، پێشبینیکردنی کارێکی لەم شێوەیە زەحمەت بوو، کارێک بوو بە خەیاڵی گەورەترین عاشقانی هەڵبژاردەی کەڵەشێرەکانیشدا نەدەهات.

لە بارەی ئەمەوە زیدان دەڵێت: "تێڕوانینی من بۆ یارییەکان لە هەر ساڵێکدا، جیاواز بوو لەگەڵ پێشوودا".

# لوكا وەكو باوك و براكانی نییە

زیدان چوار كوڕی هەیە، ئینزۆ (لە 1995 لەدایک بووە)، (لوکا 1998)، (تیۆ 2002) و (ئیلیاس 2005)، هەموویان خانەی بۆماوەیی تۆپی پێ لە گیانیاندا هەیە، لە باوكیانەوە وەریانگرتووە، هەمووشیان لە ریال مەدریددا یاریی دەكەن (ئینزۆ بەم دواییە ریالی جێهێشت) لە هێڵی ناوەڕاستیشدا یاریی دەكەن وەكو زیزۆ.

تەنیا لوكا نەبێت، كە لەسەر ێچكەی باوكی لایداوە و كەوتووەتە داوی عەشقی دەستەوانەكانی گۆڵپارێزی، حەزی لە پارێزگاریكردنە لە تۆڕی گۆڵ، ئەو كوڕی خۆشەویست و بەنازی زیزۆیە، كە باوكی پێشبینیی داهاتوویەكی جیاواز لە سێ براكەی دیكەی لێدەكات. چیرۆكی هۆگربوونی لوكا بۆ گۆڵپارێزی بۆ یاریگە بچووكەكەیماڵەوە دەگەڕێتەوە، كاتێک زیدان و كوڕەكانی تێیدا یارییان دەكرد، لەبەر ئەوەشی ئینزۆ كوڕی گەورە

بوو، ئەو تۆپەکانی لێدەدا، بۆیە لەسەر لوکای کوڕی دووەم بوو، کە ببێتە گۆڵپارێز، بە تێپەڕبوونی کاتیش لەو شوێنەدا جێگیر بوو، دواتریش ئارەزووی خۆی بۆ باوکی ئاشکراکرد، کە دەیەوێت هەر بە گۆڵپارێزی بمێنێتەوە و دەستەوانەکان لە دەست بکات.

زیدان لە بارەی لوکای کوڕییەوە دەڵێت: "ئەوەی کە زۆر لەودا سەرسامی کردووم، بەهرەمەندی و ئارەزوویەتی".

# جوانترین دووانەکانی تۆپی پێ

هەمیشە یەک هۆکار هەبووە کە زیدان لەگەڵ رۆناڵدۆی بەڕازیلیدا بجەنگێت، ئەویش یارییە نێودەوڵەتییەکانن، بەڵام هەزار هۆکار هەیە بۆ ئەوەی هەر یەکێک لەوان لە پێناو ژیانێکی دیکەدا بجەنگن، جوانترین دووانەکانی تۆپی پێ لە مێژوودا و هاوڕێیەتییەکی مەزن لە دەرەوەی یاریگەدا، کە هەرگیز تۆپی پێ بەخۆیەوە نەبینیوە.

لەبەر ئەوەی هەردووکیشیان رۆژگارێک دوو منداڵی هەژار بوون، بەڵێنیان داوە هەرچی مێژوو و جەماوەربوونیان هەیە لە بەرەنگاربوونەوەی هەژاریدا بەرجەستەی بکەن و کاری بۆ بکەن، بۆ ئەوەی جیهانێکی باشتر هەبێت، بۆ ئەوەی هەر منداڵێکی بچووکی عاشق بە تۆپ، بەبێ ماندووبوون لە جووتێک پێڵاوی وەرزشی بێ بەش نەبێت، وەکو ئەوەی ئەوان لە منداڵیدا رووبەڕووی بوونەوە.

# نەیدەزانی ئەو یاریزانێکی شکۆدارە!

ئەو کاتەی حاجی ئیسماعیل پێلاوێکی وەرزشی بۆ زەینەدینی کوڕی کڕی، یان بۆ یەزیدی کوڕی، هەروەکو لە منداڵیدا بەم ناوە بانگی دەکرد، پێی گوت: کوڕم دەمەوێت وەکو میشۆ بیت، مەبەستی میشێل پلاتینی بوو. بەڵام زیدان بە باوکی گوت: "نا، دەمەوێت وەکو ئینزۆ فرانچیسکۆلیی ئەستێرەی ئۆروگوایی بم".

دوای بیست ساڵ، زیزۆ تەنیا وەکو نموونە باڵاکەی، ئینزۆی ئۆروگوایی نەبوو، بەڵکو لەسەر یەک مێز لەگەڵ شکۆدار و بلیمەتەکانی تۆپی پێ دانیشت، هەردوو ناودارەکە، پێلێ و مارادۆنا، کە بە پێی تەرازووی زۆرینەی هەوادارانی تۆپی پێ، زیدانیش سێیەمیان بوو.

زیدان نەیدەزانی ئەو یاریزانێکی گەورەی تۆپی پێیە، وەکو چۆن محەمەد عەلی کلای دەیزانی بۆکسێنەرێکی گەورە و شکۆدارە، بەڵام دوای ئەوەی وازی هێنا، تۆپی پێ بە

زیدانی گوت، کە چەند گەورە و شکۆداری، ئەوەی بە گوێدا چرپاند. ئەو لەسەر هەقیش بوو، چونکە جەماوەر هەمیشە لەسەر هەق بوون، ئەو جەماوەرەی هەرگیز بیریان ناچێت، کاتێک پرسیار دەکرێت، کێن گەورەترین سێ یاریزانی تۆپی پێ لە مێژوودا.

ئەم دووانە لە مێشکی زیداندا بەیەکەوە جێگەیان نابێتەوە هاورێیەکانی زیدان تۆپی پێیان خۆشدەویست، بەڵام حەزیان لەوەش بوو بەردەوام بچنە سینەما، هەروەها حەزیان دەکرد بە یەکەوە بە شەقامەکانی گەڕەکەکەیاندا بگەڕێن.

زیدان لە خوێندندا سەرکەوتوو نەبوو، جگە لە تۆپی پێ هیچی دیکەی لە مێشکدا هەڵنەگرت، هەمیشە لە ناخی خۆیدا دەیگوت "یان خوێندن، یان تۆپی پێ، چونکە ئەم دوو کارە بەیەکەوە و لە یەک کاتدا کۆنابنەوە".

ئەو تۆپی پێی هەڵبژارد، هەستی بەوە کرد پێویستە هەموو هێزی خۆی پێ بدات، لەوە تێگەیشت ئەو ئەگەر بیەوێت کارێک بکات، پێویستە بۆ هیچ هۆکارێکی نەرێنی خۆی بە دەستەوە نەدات، کە وابکات خەونەکەی لە بار بچێت و ورەی بڕوخێت، هەر ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی بوو لەوەی ئەوە بەدەست بهێنێت، کە هەزاران یاریزان لە مێژووی تۆپی پێدا نەیانتوانیوە بەدەستی بهێنن.

# شکۆدارترین لێدانی سزا لە مێژوودا!

کە لێدانێکی سزا بە شێوازی بەناوبانگی (پانێنکا) و بە دەمارێکی سارد و مردووەوە و لە خولەکەکانی سەرەتای یاری کۆتایی مۆندیالدا جێبەجێ بکەیت، جا بەرامبەر کێ؟ بەرامبەر یەکێک لە باشترین گۆڵپارێزەکانی سەر گۆی زەوی، جیانلویجی بوفۆنی ئیتاڵی و لە ژێر ئەم پاڵەپەستۆ گەورە و ترسناکەدا، ئەوا بێگومان تۆ یاریزانێکی شێتی. تەنانەت بوفۆن، کە چەند ساڵێک لەگەڵ زیداندا یاری کردووە، هەندێک جار ئەو شێتییەی زیدانی دەزانی، بەڵام هەرگیز پێشبینیی نەدەکرد زیزۆ ئەم شێتییەی لەو چرکەساتەدا ئەنجام بدات.

لێدانێکی سزای زەحمەتی لە خولەکی 7ی سەرەتادا یاری کۆتایی مۆندیالی 2006دا جێبەجێکرد، دیمەنێک بوو هاوشێوەی ئەوە بوو دەمانچە بەرەو ڕووی سەری خۆت بکەیت و خۆت بکوژیت!

وەکو ئەوە وابوو زیدان لە ناخی خۆیدا بلێت، ئەگەر لێدانەکە بە فیرۆ بدەیت. ئەوا هێشتا 83 خولەک بۆ قەرەبووکردنەوە ماوە، بەڵام وای نەکرد، بەڵکو گۆڵی تۆمار کرد، بەمەش لە مێژووی لێدانەکانی سزادا ناوی خۆی تۆمارکرد وەکو یەکێک لە خاوەن شکۆدارترین لێدانەکانی سزا، ئەگەر شکۆدارترینیان نەبێت.



## دیمەنێکی هەڵواسراو لەوەتەی منداڵییەوە

لە منداڵیدا رۆژێک زیدان گریا، چونکە وەکو هاورێیەکانی پێڵاوێکی وەرزشی باشی نەبوو، بە هۆی هەژارییەوە شەرمی دەکرد، هەستی بە نەبوونیی خۆی دەکرد، چونکە ئەو لە خانەوادەیەکدا لە دایک ببوو، کە لە رووی ئابوورییەوە لە هەموو خانەوادەکانی دیکەی گەڕەکەکەیان هەژارتر بوون.

بەڵام زیدان کاتێک منداڵێکی بینی، کە هەردوو قاچی براببووەوە، نەیدەتوانی شەق لە تۆپ بدات و توانای ئەوەی نەبوو وەکو منداڵانی دیکەی گەڕەک لەسەر یاریگە تارتانەکەدا هەست بە تۆپ و چێژی یاریی بکات، گەڕایەوەماڵەوە و لە ناخەوە دووچاری شۆک بوو، لەگەڵ ناخی خۆیدا پرسیاری دەکرد، بیری لەو منداڵە دەکردەوە، کە هەردوو قاچی نییە، پاشان بە یادەوەریی خۆیدا چووەوە، کە گەورەترین خەمی کڕینی پێڵاوێکی

وەرزشیی نوێ و مارکە باشەکان بوو.
زیدانی منداڵ لەو کاتەدا هەستی بەوە کرد چەند منداڵێکی دەوڵەمەندە، چەند خۆشبەختە، لەو ساتەوە زیزۆ بڕوای وایە خوای گەورە بەخشش و نیعمەتێکی پێ بەخشیوە، کە زۆر کەسی دیکە لێی بێبەشە، هەر لەو کاتیشەوە هەمیشە بیری لە ژیانی هەژاران و کەمئەندامان دەکردەوە، هەر لەگەڵ ئەوەشدا گەورە بوو. کاتێکیش گەورە بوو و بووە یاریزانێکی ئەستێرە و ناوداری تۆپی پێ لە تەک پێلێ و مارادۆنادا، کارێکی سروشتیی بوو ببێتە باڵیۆزی ڕێکخراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و مافی مرۆڤ و و زۆرێک لە دامەزراوە خێرخوازییەکان، هەروەها سروشتیی بوو، کە هەموو ساڵێک یاریی دۆستانە و خێرخوازی لە نێوان ئەستێرە و ئەفسانەکانی تۆپی پێدا ڕێکبخات و داهاتەکەشی بداتە هەژاران.
ئا ئەمەیە زیدان، لە منداڵییەوە تاوەکو گەیشتە ریزی ئەفسانە و پاڵەوانان و دەوڵەمەندەکانیش، مرۆڤبوونی خۆی لە یاد نەکردووە.

## هەندێك وتە لە بارەی زیدانەوە

هەموو گەوهەرە بەنرخەکان لە بەرد دروست نەکراون، هەندێکی دروستکراوی رۆح و هەندێکی دیکەش دروستکراوی خەون.

زیدانِ یاریزانێکە لە ئەڵماسێکی دەگمەن دروستکراوە.

ئازیزم زیدان.. تۆپی پێ تامی نەماوە، کە لێی راهاتبووین، لێوەکانی بەیەکەوە نووساوە، ئیتر بە رووماندا پێناکەنێت، هەرچەندە تۆش هێشتا لە ژیاندایت!

جینارۆ گاتۆزۆی یاریزانی پێشووی هەڵبژاردەی ئیتاڵیا لە دانپێدانانەکانیدا بۆ رادیۆی مۆنتی کارلۆ دەڵێت، پێش بەرێوەچوونی یاریی کۆتایی مۆندیالی 2006، زیدان

خەوی لە چاوەکانی زڕاندبوو. هەروەها ئاشکرای دەکات زۆر نزای کردووە تاوەکو لە سیحر و جادووی زیزۆ رزگاری بێت.

ئازیزم جینارۆ تۆ تەنیا وا نەبووی...ئیتاڵیا هەموویان وایاندەکرد!

لە خوێنی زیداندا تەنیا تۆپی ئەدیداس هەیە... تۆپی سپی و سوور نییە

چۆن عەشقی فەرەنسا نابیت و دڵت بۆی لێ نادات، لە کاتێکدا دریسەکەی، جادووگەرێکی تۆپی پێی هەڵگرتووە، ئەو ئەفسانەیەی کورسیی سەرۆکایەتی زەردی (بەرازیل) رووخاند و تاڵییەکانی تۆپی پێی پێ چەشتن، منداڵانی قاوە، تامی ئەسپرێسۆی چیایی و قاوەی بوندوقی پاریسیان چەشت!

زیدان...

ئەو عەترفرۆشەیە، کە تێکەڵەیەکی تۆپی پێی فەرەنسی بە بۆنێکی زیرەکانە و سەرنجڕاکێش و سەرکەوتوو، پێشکەشی هەموو جیهان کرد، کە هەتاهەتایە لە یادەوەریی سەروەریی وەرزشیدا دەمێنێتەوە.

لەوەتەی رۆیشتووە، هەڵبژاردەی فەرەنسا لە ژێر هێڵی

هەژاریی تۆپی پێدا دەژیت، وڵاتی شیکپۆشی و جوانی چۆن بتوانێت یەک لە دەی زیدانێک، یان یەک لە پێنجی زیدانێکی دیکە دروست بکات؟ لە پاریس کەس وەڵامی ئەم پرسیارە ناداتەوە، خەڵکی مارسیلیاش وەڵامەکەی نازانن، تەنانەت ئەوانەشی لە هەموو زەویدا کەوتوونەتە عەشقی هەڵبژاردەی فەڕەنساوە، تا ماوەیەکی دوور و نادیار، هەر کاتێک شەوەکانی تاریکەکانی فەڕەنسا دەبینن، کە مانگەشەوی زیدانی تێدا نییە، هەمان پرسیار دووبارە دەکەنەوە.

هێمای سەرکردایەتیکردن (کاپتن) گوڵاوێک، یان قەڵەمێک و تەنانەت تەسبیحێکیش نییە، بۆ ئەوەی بکرێتە دیاری بۆ هەر قۆڵێکی بێ نرخ، کە شایەنی نەبێت.
زیدان..سەرکردایەتیکردن لەگەڵیدا لەدایکبووە.

سەرکەوتووەکان لە تۆپی پێدا، ئەوانەن کە سەرەتا بە دڵ یارییان کرد، پێش ئەوەی بە عەقڵ و جەستەیان یاریی بکەن.
زیدان لە پێشەنگی ئەوانە بووە.

دوای شکستەکان، زۆربەی یاریزانان بیر لە باشترین شوێن

دەکەنەوە، بۆ ئەوەی پشوویەکی کورت یان درێژەی لێ بەسەر ببەن، بەڵام زیزۆ دەگمەنی ئەو یاریزانانەیە، کە حەسرەت بۆ شکستەکان دەکێشن و کەوتنەکان ئازاریان دەدەن.

"لەو رۆژەی هەڵبژاردەی ئیسپانیا سەرکەوتن تۆمار دەکات، ئیتر لە سەرکەوتنەکانی ناوەستێت"
ئەوە لێدوانی زیدانە لە بارەی ئیسپانیا لە ساڵی 2002دا، کە پێشبینیی دەستبەسەرداگرتنی نازناوەکانی لە لایەن ئیسپانیاوە کردبوو، هەروەکو ئەمەش روویدا لە ماوەی 2008 تاوەکو 2012دا.

"ئەوەی زیدان بە تۆپ ئەنجامی دەدات، خەونی هەموو یاریزانێکە لە جیهاندا"
چابێ ئالۆنزۆ – یاریزانی هەڵبژاردەی ئیسپانیا

"هەمیشە، ئەگەر تۆپمان لێ ئاڵۆز بووایە لە یاریدا، بۆ زیدانمان دەهاوێشت، ئەو باش دەزانێت چۆن مامەڵە بە تۆپ بکات و چۆن لە لای خۆی بیپارێزت"
بیکشینتی لیزارازۆ – یاریزانی پێشووی هەڵبژاردەی فەرەنسا

## دوو لێدوانی زیدان

"بەختم هەبوو چونکە بە هەژاری و لە گەڕەکێکی هەژارنشین و پڕ مەترسیدا لە دایک بووم، ئەو شوێنانە تەنیا فێری تۆپی پێت ناکەن، بەڵکو فێری ژیان و خەباتیشت دەکەن"

"من زۆر هۆگری باوکمم، ئەو فێری کردم مرۆڤی کۆچبەر پێویستە زۆر زیاتر لە خەڵکی ئەو شوێنەی لێی دەژیت، کار بکات و زیاتر خۆی ماندوو بکات، هەروەها پێویستە کۆچبەر هەرگیز خۆی بەدەستەوە نەدات، ئەگەر بیەوێت بژیت".



# دەستکەوتەکانی زیدان

*لەگەڵ هەڵبژاردەی فەرەنسا

- نازناوی جامی جیهانیی 1998
- نازناوی جامی نەتەوەکانی ئەوروپا 2000
- پلەی دووەمی جامی جیهانیی 2006

*لەگەڵ یانەکان

- جامی ئینتەرتۆتۆ، 1995 لەگەڵ یوڤێنتوس
- خولی ئیتاڵیا، دوو جار، 1997 و 1998 لەگەڵ یو ڤێنتو س
- جامی کیشوەرەکان لە نێوان پاڵەوانی ئەوروپا و ئەمەریکای باشوور 1996 لەگەڵ یوڤێنتوس
- جامی ئینتەرتۆتۆ، 1999 لەگەڵ ریال مەدرید
- خولی ئیسپانیا، 2003 لەگەڵ ریال مەدرید
- خولی یانە پاڵەوانەکانی ئەوروپا 2002 لەگەڵ ریال مەدرید

- جامی سوپەری ئەوروپا 2002 لەگەڵ ریال مەدرید

- جامی کیشوەرەکان لە نێوان پاڵەوانی ئەوروپا و ئەمەریکای باشوور 2002 لەگەڵ ریال مەدرید

- جامی سوپەری ئیسپانیا، دوو جار 2001 و 2003 لەگەڵ ریال مەدرید.

# هەندێك لە دەستكەوتە تاكەكەسییەكانی

- باشترین یاریزانی جیهان لە ساڵانی 1998، 2000، 2003

- تۆپی زێڕین (بالۆن دۆر) 1998

- پێكهاتەی تیپی خەونەكان لە مۆندیالەكان (ناوی لە دوای پێلێ و مارادۆناوە هاتووە)

- باشترین یاریزان لە مێژووی 50 ساڵی ئەوروپا لە 2004.

- باشترین یاریزانی جامی جیهانیی 2006

- باشترین یاریزانی یاریی كۆتایی جامی جیهانیی 1998

- گۆڵكاری كۆتاییەكانی جامی جیهانی بە یەكسانی لەگەڵ پیلێ، فافا و هۆرست (3 گۆڵ)

- خەڵاتی لۆریۆس بۆ باشترین كاروانی وەرزشی 2010

- باشترین یاریزانی خولی پاڵەوانانی ئەوروپا لە ماوەی 20 ساڵی رابردوو لە 2011



- خەڵاتی باشترین یاریزانی جیهان لە ساڵی 1998 لەلایەن گۆڤاری وۆرڵد سۆکەرەوە
- باشترین یاریزانی هێڵی ناوەڕاست لە ئەوروپا لە 1998
- باشترین یاریزانی فەڕەنسا لە ساڵانی 1998 و 2002
- خەڵاتی گۆڤاری ئۆنز وەکو باشترین یاریزان 1998، 2000 و 2001
- ناوی لە لیستی باشترین 100 یاریزان هاتووە لە مێژوودا
- باشترین یاریزانی لاو لە خولی فەڕەنسا 1994
- باشترین یاریزان لە خولی فەڕەنسا لە 1996
- باشترین یاریزانی پیشەگەر لە خولی ئیتاڵیا لە 1997 و 2001
- باشترین یاریزان لە خولی ئیتاڵیا لە 2001
- باشترین یاریزانی پیشەگەر لە خولی ئیسپانیا لە 2002
- باشترین یاریزانی ئەوروپا لە 2002
- سێ جار لەسەریەک بە خاوەن زۆرترین جەماوەر و خۆشەویسترین پیاو لە فەڕەنسا دەستنیشانکراوە
- دوو جار ویسامی شەرەفی لە فەڕەنسا و جەزائیر پێشکەش کراوە.



## دەستکەوتەکانی وەکو راهێنەر تاوەکو ئێستا لەگەڵ ریال مەدرید

خولی یانە پاڵەوانەکانی ئەوروپا 2016

جامی جیهانیی یانەکان 2016

جامی سوپەری ئەوروپا 2016

خولی پلە یەکی ئیسپانیا (لالیگا) وەرزی 2016-2017

خولی یانە پاڵەوانەکانی ئەوروپا 2017

جامی سوپەری ئەوروپا 2017

جامی سوپەری ئیسپانیا 2017

خولی یانە پاڵەوانەکانی ئەوروپا 2018

